محەمەد حەمەساڵح تۆفیق

# ئـەمـەیـە ئـەمـەریکـا

## یادەوەریی کوردێك لە ئەمەریکادا

لە بڵاوکراوەکانی خەندان بۆ پەخش و وەشاندن

سلێمانی ٢٠٠٦

**پێشکەشە بە :**

خاتوو شێلبی کرێن Shelby Crain و خاتوو میشێڵ وارد Michele Ward و سەرجەمی ئەو ژن و پیاوە ئەمەریکیانەی شاری ڕۆزوێڵ ـ جۆرجیا، کە وەك خزم و کەسی زۆر نزیك بە دەممانەوە دەهاتن لە ژیانی دوورەولاتیماندا.

**محەمەد**


- **ناوی کتێب: ئەمەیە ئەمریکا**
- **ناوی نووسەر: محەمەد حەمە سالح تۆفیق**
- **چاپ:**
- **پیتژنین: تریفە فایەق**
- **هەڵەچن: هێمن یەحیا**
- **دیزاین و بەرگ: شۆرش ئەحمەد**
- **چاپخانە: چاپخانەی**
- **زنجیرە (٣) لە بلاوکراوەکانی خەندان بۆ پەخش و وەشاندن**

# گەشتنامەی ڕۆژنامەوانی

ئەدەبی گەریدەیی یان گەریدەناسی ئەمڕۆ لە نێو ڕاڕەوی کەلتوورو فەرهەنگی میللەتە پێشکەوتووەکاندا نێو دێڕی کتێبە کۆنەکانی سەر ڕەف، کتێبە گەورە و قەبەکانی کتێبخانە ناودارەکانی جیهانی بەجێهێشتووە و وەك ژانرێکی ڕۆژنامەوانیی تازە ڕۆحسووکانە خۆی لە سەر پەڕەی ڕۆژنامە نەتەوەیی و بان نەتەوەییەکان دەنوێنێ. لە هەموو شوێنێکی دونیادا ڕەنگە خوێنەرەکانی ڕۆژنامەیەك کە تامەزرۆی ئەدەبی گەشتنامە و گەڕانی گەریدەی وڵاتەکانن، خۆیان گەشتی هەمەجۆریان کردبێ و لەوانەشە زیاتر لە گەشتنووسەکان مەملەکەت و مەڵبەندە جیاکانی ئاوەدانیان دیبێت، بەڵام شێوازی گێڕانەوە و ڕاستگۆیی هێنانەگۆی ئەو دیمەن و دونیایەی گەڕیدە بینوێتی هونەر نواندنێکی دەوێت، کە لە هونەرمەند دەوەشێتەوە، وەستاییەك دەخوازێ کە سەنعاتکارێکی کارامەی گێڕانەوە و وەسفکردن بێت. وادەزانم کاك محەمەد حەمەسالح تۆفیق گەشتیاری ئەم کتێبەمان وەسفی سەنعاتکار و هونەرمەندێکی ئەدەبی گەریدەیی بەسەردا جێبەجێ دەبێت بۆیە خوێنەران وەختێك ئەم زنجیرە یادەوەرییەی سەفەری سەرهەڵگرتنی کوردێکیان لە ڕۆژنامەکەماندا خوێندەوە، چێژیان لێ وەرگرت و هەرمێنی بۆ (ئاسۆ)ش پەیداکرد وەختێك لە سەرەتای دامەزراندندا بوو.

گێڕانەوەی بیرەوەریی گەشت و گەڕانی کوردێك کە لەگەڵ سەدان کوردی کارگێڕ و تەکنیکار و شارەزا لە ڕێکخراوە ناحکومییەکاندا کە لە دوای ڕووداوەکانی کوردستان لە سالی ١٩٩٦دا گوێزرانەوە بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، پەند و

ئەزموونێکی دەوڵەمەندە بۆ هەرکەسێك بخوازێت لە ژیانی بەهەشتی هەندەران و تەنگوچەڵەمەکان و هەروا خۆشی و ناخۆشیی ژیانی ئاوارەیی تێبگات. دەرفەتێکە تا باشتر لە چیرۆکی بەشێك لە هاونیشتمانیانمان بگەین کە لە وڵاتی خۆیاندا بژاردەی توانا سەنگینەکانی کوردەواری بوون و لەناکاودا دوورگەیەکی بێگانە، گوام، لە دووریی هەزاران کیلۆمەتر قووتیدان. ئەگەر قەراریشە کۆچیرۆکی ژیانی هەر نەتەوەیەك کەشفکردنی سەربوردەی ڕۆڵەکانی بێت لە ناوەوە و لە تاراوگە، لە ڕێی بیرەوەریی تاکەکەسێکەوە، ئەوا ئەم یاداشتانەی کاك محەمەد ڕووناکییەکی پرشنگدارە بەو ئاڕاستەیە.

ئێمە لە دەزگای خەندان بۆ پەخش و وەشاندن بە چاپکردنی ئەم زنجیرە بیرەوەرییە ڕیپۆرتاژ ئامێزە خۆشحاڵ دەبین کە بتوانین بچووکترین بەشداری بکەین لە گەشەپێدانی ئەدەبی گەشتنامە لە ڕۆژنامەوانیی کوردی و لە کتێبخانەی کوردیدا.

لەگەڵ پیرۆزبایی و ئومێدی سەرکەوتن بۆ گەشتە لەمەودواکانی مامۆستا محەمەد حەمەساڵح تۆفیق.

**لەجیاتی ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی**
**خەندان بۆ پەخش و وەشاندن**
**ستران عەبدوڵڵا**

# وتەیەکی پێویست

خوێنەری بەڕێز

ئەمەی دەیخوێنیتەوە ئەزموونی ژیانی نزیکەی دوو ساڵێکمە، بە خێزانەوە، لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا ساڵانی ١٩٩٦ ١٩٩٨. ئەمەی من گەشتی خۆشی نەبوو بۆ وڵاتێك کە تێیدا بێجگە لە ئوتێل و سەیرانگە و مۆزەخانە و چێشتخانە و شتی لەم جۆرە هیچیتر نەبینم. ئەمە گەشتێکی ناچاری بوو کە لە دووتوێی کتێبەکەدا شتێکی لە بارەوە دەخوێنیتەوە. ئەم گەشتە یەکسەر تێکەڵی خەڵکی ئاسایی ئەو وڵاتەی کردم و لە گەڵیاندا بووم بە کرێکار و هاوڕێ و هاودەم. لەوێ ژیانم بە بێ ئارایشت وەك خۆی بینی، چاك و خراپی، جوان و ناشیرینی، هۆکارەکانی پێشکەوتنی ژیان، باری ئابووری و کۆمەڵایەتی و دەروونی و فەرهەنگیی خەڵکەکە. دەسرۆیشتن و پۆشتە و پەرداخیی هەندێك و ڕاکە ڕاکە و وێڵبوونی بەردەوامی خەڵکێکی زۆری وڵاتەکە بە دوای نان و کاردا. تەلاری هەوربڕ و ڕێگاوبانی پانوپۆڕ و ڤێلای قەشەنگ، لەولاشەوە خانووی زنج ئاسا لە شارێکی گەورەی وەك ئەتڵەنتادا کە خۆمی لێبووم.

لێرە ژیان زۆر ئاڵۆز بوو، چەندە لایەنی ڕازاوە و جوانی تێدابوو هێندەش لایەنی خراپ و پڕ گرفت. من لێرەدا بە پێی توانا و تێگەیشتنی خۆم هەوڵمداوە شتەکان و دیاردەکان وەك خۆیان بخەمە ڕوو، بێویژدانانە هەوڵ و تەقەلای چەند سەد ساڵێکی ڕەنجی مرۆڤ بۆ دروستکردنی شارستانیەتێکی زەبەلاح بە هیچ دەرنەکەم و لە هەمان کاتیشدا لایەنە دزێو و مرۆڤپرووکێنەکانی سیستەمی سەرمایەداریی ئەو شارستانیەتە بە جوان لە قەڵەم نەدەم. منێك کە تا ئێستاش بڕوای قووڵم بە

پێشبینییەکانی جاك لەندەنە لە "پاژنەی ئاسنین"دا، ناتوانم ئـەم لایەنـە فـەرامۆش بکەم و ئـەوەش دەزانم کـە بنیاتنـانی جیـهانێکی ئاسـوودە کـە چیـتر بنیـادەمی تێـدا نەچەوسێتەوە هێشتا هەر خەونێکی خۆشە و ڕەنگە وا زووش نەیەتەدی.

ئەم بابەتانەی لێرەدا دەیانخوێنیتـەوە زۆربـەیان پێشـتر لـە ڕۆژنامـەی "ئاسـۆ" دا بڵاوکراونەتەوە و ڕاستێکەشی هـەر لـە سـەر ڕوولێنـانی کـاك سـترانی سەرنووسـەری ڕۆژنامەکە بوو کە وردە وردە و بە شێنەیی دەستم دایە نووسینی بابەتەکان و پاشتر پێمدەگەیشتەوە کە مایەی ڕەزامەندیی زۆر کەسە و بـە پەرۆشـەوە دەخوێنرێتـەوە. بێگومان هەوڵمداوە تا بتـوانم لـە گـەڵ خۆمـدا ڕاسـتگۆ بم و ڕەنگـە ئـەوەی مـن لێـی دوابێتم لە دیدی کەسێکی ترەوە جیاواز بێت و ئەو وای نەبینێت. بە هەرحاڵ ئەمە تەنـها ڕاوبۆچـوون و ئـەزموونی خۆمـە و مـن لـەو دەمـەدا هـەر ئـەوەندەی لێتێگەیشتووم. بۆ گەلێ شوێن و بابەتیش کە بینیبێتم یان مامەڵەم لە گەڵ کردبێت یان شتێکم لە سەر خوێندبێتەوە و بـە باشـم زانیبێـت خوێنـەر شـتێکی لـە بـارەوە بزانێـت و زانیارییەکـەش ڕاسـت و دروسـت بێـت پـەنام بردووەتـە بـەر سـایتەکانی ئینتەرنێت لە بارەی ئەو شوێنەوە یان سوودم لـە هـەندێ سـەرچاوەی وەك گۆڤـاری ناشناڵ جیۆگرافیك وەرگرتووە. بە هیوام خزمەتێکی بچووکم گەیاندبێت.

**نـووسـەر**

# یادەوەریی کوردێکی ڕەهەندەی دوورگەی گوام

لــە ئــاخۆران و بخۆرانــی دوای ئــابی ســاڵی ١٩٩٦دا ئــەو کەســانەی لــە ڕێکخــراوە ناحکوومییەکاندا کاریان دەکرد چ بیانی و چ خۆمــاڵی و بــە تایبــەتی کارمــەندانی ئــەو ڕێکخراوانەی لە کوردستاندا بە پارەی ڕێکخراوی ئۆفـدا OFDA ی ئەمـەریکی پرۆژەکانیان ئەنجامدابوو، کە هی وای تێدابوو تەنها پرۆژەیەکیشی بەو پارەیە جێبەجێ کردبوو، هەر هــەموو بــە خاوخێزانــەوە پێچرانــەوە و بــەرەو ویلایەتــە یــەکگرتووەکانی ئەمــەریکا بەڕێخران و بەندەش یەکێك بووم لەو نزیکەی حەوت هەزار کەســەی کە بەر ئەو لێشاوە کەوتم و بە ماڵ و منداڵەوە جلەوی خۆم دا بە دەست ڕێگــەی هاتونەهاتــەوە. ئەو کەین و بەینە کاتی خۆی هەڵاوبگرێکی زۆری نایەوە و هەرکەس بــە جــۆرێ لێکیدەدایــەوە. تەواوی مەسەلەکەش لە هەڕەشە و گوڕەشەکانی ڕژێمـی عـێراقی سەدام حوسێنەوە سەرچاوەی گرتبوو گوایە تەواوی کارمەندانی ئەو ڕێکخراوانە ئامانجی ڕژێمە بۆ لەناوبردنیان چونکە بەشــدارن لــە ئاوەدانکردنــەوەی کوردســتانی وێــران و خــاپووردا. ئەڵبەتــە ڕاپۆرتــی بەرپرسەکانی ئۆفدا بۆ وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا لە سەر ئەو تەمومژ و پشێوییەی ئەو دەمــە بــاڵی کێشابوو بــە ســەر وڵاتــدا ڕۆڵــی خــۆی هــەبوو لــە ڤایلکردنی کاربەدەستاندا بــۆ وەرگرتنی بڕیارێکی لەو جۆرە. لە سەرێکی تریشەوە، دواتر بۆمان دەرکەوت، ئەمە کارێکی ئاساییە و ساڵانە ٥٠ – ٦٠ هەزار کەس بە شـێوەیەکی ڤانوونی مافی کۆچکردنــی دەدرێتــێ بۆ ئەو وڵاتە و ئەم ژمارەیە لە سەرانسەری وڵاتانی گۆی زەوی هەڵدەبژێرێت بە تایبــەتیش لە وڵاتانی ئاسیای ڕۆژهەڵات و ئەفریقا و ئەمەریکای لاتین. بێجگە لەو ژمارەیەش ساڵانە دوو ئــەوەندە و بگــرە ســێ ئــەوەندەش لــە ســنوورەکانی کەنــەدا و مەکسیك و کووبــاوە بــە ڤاچاخی خۆیان دەکەن بە ئەمـەریکادا و بـۆ خۆیــان کــار و کەســابەت دەکــەن. خــۆ بــە زیادەڕۆیی ناڵێم نیوەی خەڵکی ئەو مەکسیکە کاولـە ڕوویـان کردووەتـە ئەمـەریکا هەر بـۆ ئەوەی بژین (دواتر دێمە سەر هەندێ وردەکاریی ئەم باسە). کەواتە بردنــی حــەوت هــەزار کەسێك بۆ ئەمەریکا لە ساڵی ١٩٩٦دا کارێکی ئاسایی بوو، بەڵام لای خۆمان نامۆ بوو چونکە کە سەرمان لە هێلکە جووڤاوە خۆمـان لـە وڵاتێکی تەلبـەند و بەندیخانـەدا بینیوە و ئـەم هەڤی سەفەر و ژیانە لە شوێنێکی تری سەر ئەرزدا لـە فەرهـەنگی ئێمەدا نـەبووە. کەچی ئـەم فەرهەنگە لای ڤێتنـامی و هنـدی و کـەمبۆدی‌و پاکستانی زۆر ئاساییە و لـە سـەرێکی

تریشەوە لەودەمەوە کە کەشتییەکەی کۆلۆمبس لە کەنارەکانی ئەو وڵاتە پانوپۆڕە لەنگەری گرت و پاشان لە ئەوروپا و دواتر هەموو شوێنێکی سەر زەوییەوە خەڵکی کۆچیان بۆ کرد، ئیتر ئەمە بوو بە نەریت و سەرجەمی خەڵکی وڵاتەکە لە مێژوودا لەو کۆچبەرانە پێکهاتووە و بێجگە لە "هندییە سوورەکان" کە خەڵکی ڕەسەنی ئەو وڵاتەن و ئێستا خەریکە تاقبڕ دەبن، کەسی تر هیچ ڕەگێکی قووڵی لەو وڵاتەدا نیە.

بە کورتی، خەڵکەکە پۆل پۆل لە زاخۆوە دەبرانە تورکیا و لەوێ تەنها شەوێك یان دوان لە سلۆپی دەمانەوە و پاشان لە فڕۆکەخانەیەکی سەربازیی شاری باتمانەوە، کە زۆر دوور نەبوو لە دیاربەکرەوە، ڕەوانەی دوورگەی گوام دەکران لە ژێر ناوی پرۆسەیەکدا کە بە پەناگەی ئارام Safe Haven ناودەبرا. ژمارەیەك فڕۆکەی زەبەلاح بۆ ئەم پرۆسەیە بەکرێ گیرابوون. ئێمەیان بە فڕۆکەیەکی فەرەنسی گواستەوە کە نزیکەی چوارسەد کەسی دەگرت و ماوەی بیست سەعاتی برد تا گەیشتینە دوورگەی گوام و لەو ماوەیەدا تەنها دوو سەعات لە ئەبووزەبی و دوو سەعات لە شاری کۆلۆمبۆی وڵاتی سریلانکا نیشتینەوە بۆ پاککردنەوەی فڕۆکەکە و بەنزین وەرگرتن، واتە شانزە سەعاتی ڕەبەق بە ئاسمانەوە بووین. ئەو ماوەیە دەتوت خۆڵی مردووت کردووە بە سەر ئەو خەڵکەدا، هەموو مات و بێدەنگ، نەماندەزانی بۆ کوێ دەچین و چیمان بەسەردێت، ئەوە نەبێت کە لە ناو فڕۆکەکەدا نامیلکەیەکی دوو سێ لاپەڕییان داینێ لە بارەی گوام و مانەوەی کاتیمان لەوێ.

ئێمە زۆربەمان یەکەمجار بوو سواری فڕۆکە ببین و زۆریش ترسناك بوو، بە تایبەتی کە یانزە هەزار مەتر بەرز بووبووینەوە و زۆربەی کات بە سەر دەریای عەرەب و ئۆقیانووسی هندی و پاسیفیکدا دەفڕین. دەمە و بەیانییەکی زووی زستانی ١٩٩٦ گەیشتینە مەنزڵ و لە فڕۆکەخانەی گوام سەربازانی ژن و پیاوی ئەمەریکی بە ڕوویەکی خۆش و سێو و پرتەقاڵەوە لە پێشوازیماندا بوون و بەمە ئاسوودە بووین و پاش حەوانەوەیەکی کەم بردینیان بۆ ئەو شوێنانەی بۆمان دیاریکرابوو، لە بنکەی هێزی ئاسمانی و دەریایی ئەمەریکا لەو دوورگەیەدا. ئێمە بەر کەمپ و خانووەکانی هێزی دەریایی (مارینز) کەوتین و هەر دوو یان سێ خێزان لە خانوویەکی قەشەنگی بنکەکەدا جێگیرکراین کە بە تایبەتی بۆ ئێمە چۆڵکرابوو.

گوام دوورگەیەکی سەوز و جوان و قەشەنگی ئۆقیانووسی پاسیفیك بوو. ئەم دوورگەیە لە ساڵی ١٨٩٨ ەوە بووبووە کۆلۆنیی ئەمەریکا. ڕووبەرەکەی هەر لە سلێمانییەوە تا

عەربەت و لە چیای گڵەزەردەوە تا گۆیژە دەبوو و نزیکەی سەد و حەفتا هەزار کەسێکی لە سەر دەژیا کە تێکەڵەیەکی فلیپینی و دوورگەکانی دەوروبەری بوون. هەڵکەوتی جوگرافیی گوام، دەکەوێتە سەر هێڵی پانی ١٣ ی سەروو هێڵی کەمەری زەوی و یەکێکە لەو دەیان دوورگە بچووك و گەورانەی لە ڕووی جوگرافییەوە زنجیرە شاخ و وشکایی ماریانای باکوور پێکدێنن Mariana Trench کە لە کلکەی خوارووی ژاپۆنەوە بەرەو ئوستراليا درێژ دەبێتەوە و گەورەترین دوورگەشی مارشاڵە. هەر دوورگەیەکیش لەوانە بۆ خۆی قەوارەیەکی سەربەخۆیە و لە فیدراڵیەتێکدا لەگەڵ حکومەتەکانی دوورگەکانی تردا یەکیانگرتووە و بە پێی هەل و مەرجێکی تایبەت لە قەڵەمڕەوی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادان.

کەشوهەوای گوام گەرم و شێداری ئیستیوائییە و ساڵ دوانزەی مانگ بارانی لێدەبارێت و کەم ڕۆژ خۆش و بێبارانە و لە مانگی دیسەمبەر بۆ تەمووز کە گوایە کەشی وشك و کەمبارانیی ناوچەکەیە، کەچی ڕۆژی حەوت جار دەبارێ و هەر تۆزێك هەڵم و تەم کەوتە ئاسمان خێرا دەبێتە هەور و بارانی لێدێتە خوارەوە. ئەو خانووانەی ئێمەی تێدا نیشتەجێ کراین، هەم ئامێری فێنککەرەوە و هەم شێ دەرکەریشی تێدابوو، بەڵام لە دەرەوە گەرم و چەند دەقیقەیەك هەتاو دەرکەوتایە هێند گەرم بوو دەیبرژاندی، لەبەرئەوە هەموو سەربازانی کەمپەکە، کە بۆ خزمەت و ڕاییکردنی کاروباری ئێمە دانرابوون، هەریەکە بوتڵێك ئاوی پێبوو و هەر تاوناتاوێك قومێکی لێدەدا بۆ ئەوەی گەرما وشکی نەکاتەوە.

ئەو دوورگەیە هەموو شوێنێکی سەوزایی و دارودرەخت بوو. یەك دوو شاخی بەرزی پڕ دارودرەختیشی تێدابوو کە هەرە بەرزەکەیان چیای لاملام Lamlam بوو، بە ئەندازەی شاخی بەرانان (گڵەزەردە) بەرز دەبوو. دارگوێزی هندیی زۆربوو، ئەو دار لاستیکەی "مطاط" لای خۆمان ساڵی دوو سێ گەڵا بکات پێمان خۆشە، لەوێ بە ئەندازەی دارتووی کۆنەساڵ بەرز دەبوو و بگرە زیاتریش و لە سەریشەوە ڕەگی هەوایی شۆڕببووبۆوە و پاشان چووبوو بە زەویدا و هەر دارمەتاتێك دەیان قەدی ئەستووری هەبوو، ڕووەکی گوێچکە فیل و قەفەزەی سنگیش دنیایان داگیر کردبوو. دوورگەکە هەندێك کانیاوی شیرینیشی تێدابوو و چواردەوری تا چاو بڕبکات شەپۆلەکانی ئۆقیانووسی پاسیفیك بوو. ئەو ئۆقیانووسەی لە ئاسمانی بەرزەوە بە شین دەمانبینی لە نزیکەوە یەك پارچە شەپۆلی بۆر و تەڵخە و زیاتر لە هەردە و هەڵەتی پێدەشتەکانی لای خۆمان دەچێت. گوام

مێژوویەکی دوورودرێژی داگیرکاری و کۆلۆنیالیی هەیە، لە سەدەی شانزەدا ماجەلانی پێدا تێپەڕیوە و ماوەیەکیش لەوێ ماوەتەوە. ماجەلان دەریاوانێکی بەناوبانگی ئیسپانی بووە و لەو چەرخ و ڕۆژگارەدا ئیسپانیا و پورتوگاڵ میری دەریا و زەریاکان بوون و زۆربەی دوورگە و وڵاتانی سەر دەریا کۆلۆنیی ئەمان بوون، بە گوامیشەوە کە کۆلۆنییەکی ستراتیجیی ئیسپانیا بووە و ماوەی سێ سەد ساڵ زیاتر لە ژێردەستیدا بووە.

ساڵی ۱۸۹۸ جەنگێك بەرپا بووە لە نێوان ئەمەریکا و ئیسپانیادا و ئەنجام ئیسپانیا جەنگەکەی دۆڕاندووە و گوامی لە دەست دەرچووە و بووە بە کۆلۆنیی ئەمەریکا. بەڵام سەیر لەوەدایە، تا ئێستاش کولتوور و فەرهەنگی خەڵکەکە هەر کاریگەریی فەرهەنگی ئیسپانیی لە سەرە و تا ئێستاش فەرهەنگی ئەمەریکایی بە تەواوەتی جێی خۆی نەکردووەتەوە لە نێو خەڵکی گوامدا کە چەمۆڕۆیان Chamorrow پێدەڵێن و بە ڕەچەڵەك دەچنەوە سەر ڕەگەزی مالیزی – فلیپینی و تێکەڵەی خەڵکی ئەو سەدان دوورگەیەی ئەو ناوە. (لە لاپەڕەکانی داهاتوودا وردەکاریی زیاتر لە سەر گوام دەخوێنیتەوە).

ئێمە لە گوام کرابووین بە دوو بەشەوە، نزیکەی هەزار کەسێکمان بەر کەمپ و خانووەکانی هێزی دەریایی (مارینز) کەوتبووین لە شوێنێکی بەرزی زۆرخۆشی دوورگەکەدا و دەیڕوانییە سەر ئۆقیانووسی پاسیفیك و شاری ئەگاناشدا، کە پێتەختی دوورگەکە بوو. ئەم بەشە پێیان دەوت تیجان یان تییان Tiyan. ئەودوای خەڵکەکە کە ماوەی ۱۰ – ۱۲ کیلۆمەترێك لە باکووری ئێمەوە بوون لە کەمپی بنکەی هێزی ئاسمانی کە ناوی ئەندەرسن ساوس Anderson South بوو، لە بەر تەختیی شوێنەکە و قەرەباڵغیی خەڵکەکە لێرە ناڕەحەت بووبوون. لە هەردوو شوێنەکە نەیاندەهێشت تێکەڵی شار و خەڵکی دوورگەکە ببین و هەموو پێداویستیی خۆراك و پۆشاك و شوێنی حەوانەوەیان بۆ خەڵکەکە دابین کردبوو. هەر دوو ماڵ و سێ ماڵ لە خانوویەکی سێ چوار هۆدەییدا خەڵکەکەی وەڕس کردبوو و گەلێ کێشەش دروست دەبوو لە سەر خواردن و چێشتلێنان و قسە و قسەلۆکی ژنان. لێرەوە پرۆسێسی موعامەلاتی خەڵك ڕایی دەکرا، لە ڕێگەی دەزگای کۆچی ئەمەریکییەوە Immigration Naturalization Service کە کورتەکەی بە INS دەناسرێ و ژمارەیەکی زۆر کوردی پێشتر نیشتەجێی ئەمەریکایان هێنابوو بۆ کاروباری وەرگێڕان و ڕاییکردنی موعامەلاتی نیشتەجێکردن لە ویلایەتەکانی ئەمەریکادا. ئەوجا لە پاش نزیکەی سێ مانگ وردە وردە و بە وەجبە گواستنەوە دەستی پێکرد بۆ ناو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.

وەك پێشتر باسم كرد قەدەغە بوو تێكەڵی خەڵك بین، چونكە جارێ لە ڕووی قانوونییەوە هیچ بارێكمان ساغ نەبووبۆوە، بەڵام هەندێ جار خەڵكێكی ئەوان بۆ ئەنجامدانی هەندێ كاروبار دەهاتنە كەمپەكانەوە و چەند جارێك هەندێك كچ شوویان دەكردە كوردی لای خۆمان بۆ ئارایشت لەگەڵ كۆمەڵێكی تردا دەیانبردنە ناوشار و هاوكاریی دەكران، یان هەندێك ژن بۆ منداڵبوون دەبرانە نەخۆشخانەكان. بەڵام بەردەوام ڕۆژنامەیەكی سەرەكیی دوورگەكەمان پێدەگەیشت وابزانم ناوی پاسیفیك نیوز بوو و هەواڵی جۆراوجۆری دورگەكەی لەخۆ دەگرت. یەك لەو هەواڵە سەیرو سەمەرانە باسێكی ئێمە بوو كەوا "چەند هەزار كوردێك لە باكووری عێراقەوە، لە دەست سەدام حوسێن هەڵاتوون و لە ڕێگەكاندا بەرەو ئەمەریكا هێنراونەتە ئێرە و بێئەوەی بیانبینین یان تێكەڵیان بین ڕێژەی دانیشتوانی دوورگەكەیان لە سەدا ١٠ بەرزكردووەتەوە"، هەروەها لە سەر ڕووپەڕی ڕۆژنامەكە گەلێ سكاڵا و نارەزایی دەبینرا لە سەر داگیركردنی ئەمەریكا بۆ جزیرەكە و شێوازی بەڕێوەبردنی، كە جارێك وەك موقاتەعەیەكی تایبەت territory حیسابی بۆ دەكرا و جارێك دەكرا بە پاشكۆی ویلایەتی هاوای كە حەوت سەعاتی فڕۆكە لێیەوە دووربوو. تەنانەت حاكمی دوورگەكە لەو دەمەدا، كارڵ گۆیتەرێز، داد و بێدادی بوو لەو بارودۆخە. ئەو دەمە ئێمە لەوێ بووین تەكنیكی پەیوەندی كردن وەك ئێستا نەبوو و زۆر بەكەمی بە تەلەفۆن دەمانتوانی پەیوەندیی بكەین بە ئەمەریكا و ئەورووپاوە و زیاتر نامە ناردن بوو، ئەویش زۆر سست و خاو بوو. تەلەفزیۆنیش تەنها CNN كەڵكی هەبوو ئەویش بۆ ئەو ناوچانەی ڕۆژهەڵاتی ئاسیای دوور و پاسیفیك تەنها هەواڵەكانی ئەو شوێنانە و هەندێكیش ئەمەریكا و جاروبارێكی كەم هەواڵی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی پەخش دەكرد و تا ڕادەیەك دابڕابووین. نەشماندەزانی كەی موعامەلاتمان تەواودەكرێ و ئایا دەچینە ئەمەریكاوە یان نە، لەوێ چیمان بەسەردێ و چۆن دەژین. ئەمانە هەموو پرسیاری بێ وەڵام بوون و بەتەواوی نیگەرانیان كردبووین و ئەو چاوەڕوانییە بێزاری كردبووین. ئەو كوردانەی كە لە ئەمەریكاوە هێنرابوونە ئەوێ بۆ كاروباری موعامەلات و وەرگێڕان وەڵامێكی وایان دەدایەوە كە زۆر دڵخۆشكەر نەبێت و دەیانوت خۆت و بەختت بەر كوێ دەكەویت، ڕەنگە بەر شار و ویلایەتێك بكەویت ڕێكخراوی خۆبەخش یان كەنیسەكان هەموو شتێكت بۆ مەیسەر بكەن یان بەر شوێنێك بكەویت مقەبا شڕەیەكیشت پێ ڕەوا نەبینن و ناچاربیت خۆت كاری خۆت مەیسەر بكەیت. ئەمەریكییەكان خۆیشیان هەر وایان پێدەوتین. ئێمە ئەوكاتە بڕوامان بەم قسانە نەدەكرد و دەمانوت ئەمانە درۆمان

لەگەڵ دەکەن، کەچی دواتر کاتێ چووینە ئەمەریکاوە بۆمان دەرکەوت وایە و ئەولاتریش و ئێرە وەك ئەوروپا نیە هەموو شتێکت بۆ دابین بکەن. بەهەرحاڵ دواتر دێمە سەر ئەم باس و خواسە.

من مانەوەی نزیکەی چوار مانگم لە گوام بە هەل زانی و کەوتمە تەواوکردنی وەرگێڕانی کتێبە ناوازەکەی میدڵ ئیست ووٚچ "جینۆساید لە عێراقدا و پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد"، کە تا ئێستاش بابەتیترین و زانستیترین کارە لە سەر ئەنفال ئەنجامدرابێت. ڕۆژانە ١٠ – ١٢ سەعات کارم تێدا دەکرد بەو هیوایەی کە چووینە ئەمەریکاوە ئەو دەزگایەی دەریکردووە زۆر کەیفخۆش دەبێت و یەکسەر وەرگێڕانە کوردییەکەی چاپ دەکات و ستایشی منیش دەکەن، کەچی بە پێچەوانەوە تووشی سەرئێشەشی کردم. لە گوام ڕاستە خواردن زۆر بوو و یانەیەکیش تەرخان کرابوو بۆ پشوودانو کات بە سەربردن و تەماشای تەلەفزیۆن و خوێندنەوەی کتێبی جۆراوجۆر و "تاقە ڕۆژنامەکەی گوامیش"، بەڵام من لەوماڵەدا کە تێیدا لەگەڵ ماڵی کاك حەسەن و کاك دڵشاد نیشتەجێ کرابووین کورسی و مێزێکم دەست نەکەوت لە سەری بنووسم و کاری ڕاست بێت ماموٚستا ئەرشەدی شێخ حەسەن کارتۆنە مقەبایەکی ئەستووری بۆ پەیداکردم لە سەری بنووسم. لەوێ دەبوو هەر دوو ڕۆژ جارێك بچیت لە گەنجینە سەموون و خۆراکی وشکە و گۆشت و مریشك و سەوزە و میوەی ئەو دوو ڕۆژە وەربگریت بۆ ئەو کەسانەی لەو خانووەدا نیشتەجێن و ئێمەش ئەم کارەمان کردبوو بە نۆرە لە ناو خۆماندا، بەڵام هەردوو دراوسێکەم فرەجار منیان لەو ئەرکە دەبوارد بۆ ئەوەی خەریکی وەرگێڕانی جینۆساید بم. تەنها شتێك کە ئاسوودەی دەکردم ئەوەبوو ژوورەکەم لە نهوومی دووەم بوو و دەیڕوانییە سەر پانتایی ئۆقیانووسی پاسیفیکدا، کە فرەجار دیمەنی پاپۆڕێکی کێوئاسا یان نەهەنگێك لە دوورەوە ئاسوودەی دەکردم. وەك وتم من سەرومڕ ئەو کاری وەرگێڕانەم دەکرد و تەنها ئێواران ماوەی نزیکەی سەعاتێك دەچوومە یانەی حەوانەوە و لەوێش پرسیاری ناوی ئەو شاخ و گوند و شوێنانەم دەکرد کە لە دەقە ئینگلیزییەکەدا بە هەندێك شێواوی نووسرابوون و ئەوی خۆم شارەزای نەبوومایە لە زاری ئەو دۆستانەمەوە کە خەڵکی ناوچە جیاجیاکانی کوردستان بوون ڕاستم دەکردنەوە.

ئێمە دواتر بیستمانەوە کە لە وڵاتی خۆمان قاو داکەوتووە گوایە بردووینیان بۆ جزیرەیەکی دوور و لەوێ زۆربەمان هەر مەیموون خواردووینی و ئەمەش کەسوکارمانی

زۆر نیگەران کردبوو. ڕاستە جزیرەکە دوور بوو و لە دیدی وڵاتی خۆمانەوە لەوپەڕی دنیابوو، بەڵام ئێمە لەم جەنگەڵستانی دوورگەیەکی ئیستیوائیدا یەك مەیموونیشمان نەبینی، بەڵکو منداڵە بچووك و لاسارەکانمان بووبوونە مەیموون و بە دارگوێزی هندیدا هەڵدەزنان. لە ئاژەڵ و گیانداری کێویدا ئەوەی سەرنجی ڕاکێشاین ئەم دوورگەیە جۆرە مارێکی زۆری تێدابوو پێیان دەوت ماری قاوەیی و گەلێ جار لە کەمپی ئەندرسن ساوس دەچوونە ماڵەکانیشەوە بەڵام لە کەس نەبیستراوە هیچ زیانێکیان بۆ بنیادەم بووبێت. جارێکیان من لە ڕۆژنامەکەی گوامدا خوێندمەوە کە ئەم مارانە جێی مەترسین بۆ مراوییە کێوییەکانی دوورگەکە چونکە بەزۆری دەیانخۆن.

لە گوامدا زۆربەی خانووەکان نزم دروست کراون و یەك نهۆم یان دوو نهۆمن لەبەر جۆرە زریان و گەردەلوێك کە دەریای چین و ئۆقیانووسی پاسیفیك و وڵاتانی فلیپین و چین و ژاپۆن و تایوان و دوورگەکان بە دەستیەوە دەناڵێنن. ئەم زریانە ناوی تایفوونەساڵی هەشت نۆجار لەم ناوچانە دەدات و گەلێ زیانی مادی و گیانییان لێدەکەوێتەوە. لەم جۆرە زریانەدا خێرایی با دەگاتە نزیکەی ٣٠٠ کم لە سەعاتێکدا و تا ئەو خێراییەش زیاتر بێت زیانی زۆرتری لێدەکەوێتەوە. چەقی زریانەکە پێی دەڵێن چاو، با توندەکەش بەدەوریدا دەسووڕێتەوە و هەرچییەکی بەرکەوێ ڕایدەماڵێ و تێکیدەشکێنێ و شەپۆلە بەرزەکانی دەریاش لە دوورگەکاندا گەلێ شوێن ژێر ئاو دەخەن. لێرە پەنجەرەی خانووەکان لە پشت شووشەکانەوە بە دەرابەی ئاسن گیراوە و لە کاتی تایفووندا دادەدرێتەوە سەر پەنجەرەکان نەوەك ڕەشەبای توندی زریانەکە بیانشکێنێ. پێش بەرپابوونی گەردەلوەکە بە میدیا بانگەواز بڵاودەکرێتەوە کە ئاو و خواردنی نزیکەی ٤ – ٥ ڕۆژی ماوەی زریانەکە هەڵبگیرێت و کەس لە ماڵ نەچێتەدەر و هەرچی دامودەزگایە خۆیان ئامادە دەکەن بۆ بەرەوڕووبوونەوەی هەر پێشهات و کارەساتێك. ئەو دەمە ئێمە لەوێ بووین تایفوونێك هەڵیکرد چاوەکەی لە نزیك دوورگەی سایپانەوە بوو کە نزیکەی ٣٠٠ کیلۆمەتر لە گوامەوە دووربوو کەچی لەوێ باوبۆران کارێکی پێکردین با بە دەواری شڕی نەکات و خەڵکی دوورگەکە و ئێمەش لەترسا گیان گەیشتبووە کونە لووتمان. لە مێژووی ئەم دوورگەیەدا تایفوون و جۆرێکی تریش کە پێی دەڵێن سوپەر تایفوون و زۆر بەهێزترە، گەلێ زیانیان داوە بەتایبەتی لە خانووبەرەی نەریتی و کۆنی خەڵکی ڕەسەنی دوورگەکە (چەمۆرۆ) کە ژیانیان لە سەر ڕاوە قرژاڵ و ماسی و هەندێ کشتوکاڵی ئیستیوائیە و بەو خانووانەدا دیارە گوزەرانیان زۆر خۆش نیە. بەڵام لە شاری ئەگانا بینای بەرز و جوان هەن و خانووبەرەش

له سەر مۆدێلی نوێو فرەجاریش له سەر مۆدێلی چینی و ژاپۆنی دروستکراون و باکیان به تایفوونو باوکی تایفوونیش نیه. ئەوەی لەگوامدا زۆر سەرنجی ڕاکێشام و له ڕۆژنامەکه (کە بە زمانی ئینگلیزییە) و ئەو چەند کەسە کەمەی دەمبینین پاراستنی فەرهەنگی ئیسپانی بوو. لای دانیشتووان بێجگه لە زمانی چەمۆرۆ زمانی ئیسپانی دووەم زمانە و ئینگلیزی، هەرچەندە زمانی ڕەسمیشه، بەلآم دوای ئەو دێت. له ڕۆژنامەکەدا کاتێ هەواڵی مردنی کەسێکیان بڵاودەکردەوە چارەکە لاپەڕەیەکی دەگرتەوە بەم مانایە: "فلآن کەس بەر ڕەحمەتی خودا کەوتووە و باوکی فلآن و فیسارە و خەزووری فلآن و فیسارە و زاوای فلآن کەسە و پوورزا یان ئامۆزای ئەم و ئەوە و ئیتر بەتانیدا دەڕۆیشت تا دەگەیشتە ئەوەش کە بە خوێی چێشت پێیان دەگاتو پاشان دەیوت لە فەلآن کەنیسە ڕاکشاوە بۆ ماڵئاوایی کردن". لە بەشی ئاین و باوەڕی ڕۆژنامەکەشدا هەرچی ئاین و مەزەبی سەر ئەرزە لەم دوورگەیەدا جاڕ بۆ خۆیان دەدەن بە مەسیحی و جوولەکە و ئیسلام و بووزی و کۆنفۆشیۆسی و کاسۆلیك و پرۆتستانت و نازانم چی و چییەوە. بەلآم ئەوەی زۆر سەرنجی راکێشام جاڕدانی کۆمەڵێکی بەهائی بوو بۆ ئایین یان ئاینزاکەیانو ناوەکانیشی لە عەرەبی دەچوون و ئەمەم لە هیچ شوێنێکی تری سەر ئەرزدا نەبینیوە. ئەوەی زۆر سەرنجی راکێشام و یەکەمجار بوو چاوم پێبکەوێت شۆرت لەپێکردنی ژنان بوو. لەوێ ئەو ژنە ئەفسەر و سەربازانەی بۆ بەڕێوەبردنی کەمپەکەی ئێمە هەڵدەسووڕان بەیانیان بە جلی خاکیی سەربازییەوە و گەلێکیشیان ئێواران نیوەڕووت و بە شۆرتێکی کورتەوە دەسووڕانەوەو ڕانە سپی و ناسکەکانیان ئاوی چاوی دەبرد و لیکی پیاوانی ئێمەی بۆ دەڕژا.
لە ناو ئەوانەدا ئەفسەرە ژنێکی زۆر جوان هەبوو ناوی کاپتن کۆرین بوو، ئێواران هەرچی کوردە دەبوو بە تەماشاکەری پاو پووزە خڕومڕەکانی کاتێ کە شۆرتی لەبەردەکرد. لەوێ خەڵك لە کۆرسی جۆراوجۆری فێربوونی زمان و موحازەرات لە سەر ژیان و گوزەرانی ئەمەریکا بەشداری دەکرد و ئەو هۆڵەی کەوا کاپتن کۆرین موحازەرەی تێدا دەوتەوە بەرنەدەکەوت و زۆر قەرەباڵغ بوو لەبەر جوانیەکەی. ماوەیەك کاپتن کۆرین دیارنەما و پاشان گرژ و مۆن دەردەکەوت. قاو داکەوت، گوایە کوردێکی دۆنەدیو داوای ماچێکی لێکردووە، بەلآم بۆم ساغ نەبوەوە ڕاست بوو یان درۆ!

# هەندێك زانیاری لە سەر دوورگەی گوام

خوێنەری بەڕێز

لە دواودوایی ساڵی ١٩٩٦دا کاتێ نزیکەی حەوت هەزار کورد لە کوردستانی عێراقەوە گوێزراینەوە بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و قۆناخی یەکەمی سەفەرەکە و نیشتەجێکردنی کاتیمان دوورگەی گوام بوو، کە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و ئۆقیانووسی پاسیفیکەوە، کەسوکار و خەڵکی ولاتی خۆمان دەستیان لێشۆردین و هەر یەکە قسەیەکی کردبوو، وەك فڕێیانداوونەتە دوورگەیەك و خەریکە لە برسا دەمرن و مەیموون و تیمساح هەموویانی خواردووە.

ڕاستێکەی ئەم شوێنە تا بڵێی دوور بوو بەڵام دەتوانم بڵێم خۆشترین شوێنی سەر ئەرز بوو. لێرەدا هەندێك زانیاریی لە سەر ئەم شوێنە بۆ نموونە دێمەوە وەك بەراورد کدێك لە گەڵ ولاتی خۆماندا، بۆ ئەوەی بزانرێ چەندمان جیاوازیی هەیە لە ڕووی تۆماکردن و بە دۆکیومێنت کردنی ورد و درشتی بوارەکانی ژیاندا. کەسێکیش بیەوێ شتی زیاتری لە سەر بزانێ دەتوانێ بچێتە سەر سایتەکانی ئینتەرنێت و بەراوردی خۆی بکات.

- دوورگەی گوام لە ساڵی ١٥٢١ دا لە لایەن فێردیناند ماجەلانی Ferdinand Magellan دەریاوانی ئیسپانییەوە دۆزرایەوە.
- دەکەوێتە سەر هێڵی پانی ١٣ ی سەروو کەمەری زەوییەوە، لە ڕۆژهەلاتی ئاسیای ئۆقیانووسی پاسیفیکدا و یەکێکە لە دوورگەکانی ماریانای باکوور. ماوەی نزیکەی ٢٣٠٠ کم لە ڕۆژهەلاتی فلیپین و باشووری ژاپۆنەوەیە.
- ڕووبەری ٥٤٩ کیلۆمەتری چوارگۆشەیە، درێژیی ٤٥ و پانیی نزیکەی ١١ کیلۆمەترە.
- ژمارەی دانیشتوانی ١٦٨ هەزار کەسە.
- بەرزترین شاخ: لاملام Lamlam ٤٠٦ مەتر.
- سەرچاوەی سروشتی: ڕاوەماسی و گەشتوگوزار (بە تایبەتی ژاپۆنی).
- زریانی زۆر لە وەرزی باران باریندا و بە تایبەتی تایفوونی ترسناك لە مانگەکانی (حوزێران – دێ سەمبەردا).

- ژینگە: لەناوچوونی باڵندەی دوورگەکە لەلایەن ماری قاوەییەوە کە حاڵی حازر زۆر بە خێرایی زاوزێ دەکەن و زیاد دەکەن.
- تێکرا ڕێژەی تەمەنی دانیشتوان: ٦٥ ساڵ.
- تێکرا ڕێژەی زیادکردنی دانیشتوان: ١،٤٦٪.
- تێکرا ڕێژەی مردن: ٤،٤١ لە هەزاردا.
- تێکرا ڕێژەی مردنی منداڵ: ٦،٩٤ لە هەزاردا.
- گرووپی ئەتنی: چەمۆڕۆ ٣٧٪، فلیپینی٢٦٪، خەڵکی دوورگەکانی تری پاسیفیك ١٢٪، سپی پێست ٧٪، ئاسیایی ٧٪، تێکەڵە ١٢٪.
- ئاین: کریستیانی کاسۆلیك ٨٥٪، هیتر ١٥٪.
- زمان: ئینگلیزی ٣٨٪، چەمۆڕۆ ٢٢٪، زمانەکانی فلیپین ٢٢٪، زمانەکانی تری دوورگەکانی پاسیفیك ٧٪، زمانە ئاسیاییەکان ٧٪، هیتر ٤٪.
- ڕێژەی خوێندەواری: ٩٩٪.
- حاڵەتی سیاسی دوورگەکە: هەرێم یان موقاتەعەیەکە سەر بە کاروباری دوورگەکان لە وەزارەتی ناوخۆی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.
- پایتەخت: شاری ئەگانا Agana.
- پشووی نیشتمانی: ڕۆژی دۆزینەوەی دوورگەکە لە ساڵی ١٥٢١ (کە دەکاتە یەکەم دووشەممەی مانگی مارتی هەموو ساڵێك).
- دەنگدان: تەمەنی ١٨ ساڵ، هەموو دانیشتوان هاوڵاتی ئەمەریکین، بەڵام لە هەڵبژاردنی سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکاندا مافی دەنگدانیان نیە.
- ئەنجومەنی یاسادانان: ١٥ کەسە و هەردوو ساڵ جارێك هەڵبژاردنی گشتی بۆ دەکرێت. حیزبی دیموکرات ٦٪ و کۆماری ٩٪.
- ئاڵا: لە پاڵ ئاڵای ویلایەتە یەکگرتووەکاندا ئاڵای دوورگەکەش هەڵدەکرێت کە بریتییە لە ڕەنگی شینی تێر و چوارچێوەیەکی سوور و لە ناوەڕاستدا کەشتییەکی چارۆکەدار و داری گوێزهندێك.
- ئابووری: خەرجی سوپای ئەمەریکی، گەشتوگوزار، ڕاوەماسی و کشتوکاڵ.
- هێزی کار: ٦٠ هەزار کەس.
- بودجە: داهات ٣٤٠ ملیۆن دۆلار خەرج ٤٤٥ ملیۆن دۆلار (کە ئەمەریکا هاوتای دەکاتەوە).

- بەرهەمی کشتوکاڵ: میوە، گوێزهندی وشککراوە، سەوزە، هێلکە، گۆشتی بەراز، پەلەوەر(دەواجن)، گۆشتی مانگا.
- پیشەسازی: سوپای ئەمەریکی، گەشتوگوزار، بیناسازی، کەشتیسازی، چیمەنتۆ، چاپ و بڵاوکردنەوە، پیشەسازیی خۆراك، چنین.

بەرهەمی کارەبا: ٨٣٥ ملیۆن کیلۆ وات (کە ٧٧٦ی سەرف دەبێت).

- بەکارهێنانی بەرهەمی نەوت: ٢٠ هەزار بەرمیل ڕۆژانە.
- کاڵای هەناردە: گواستنەوەی بەرهەمە نەوتییەکان، کەرەستەی بیناسازی، ماسی، بەرهەمی مەشروبات وخۆراك.
- کاڵای هاوردە: بەرهەمەکانی نەوت، خۆراك، کەلوپەلی پیشەسازی. لە سەنگافوورە، ژاپۆن، کۆریای باشوور، هۆنگ کۆنگەوە.
- یارمەتی ئابووری: گوام لە گەنجینەی حکومەتی فیدراڵی ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە ساڵانە نزیکەی ١٥٠ ملیۆن دۆلار یارمەتی وەردەگرێت و بەپێی یاسایەکی تایبەتی کۆنگرێس خەڵکی گوام باجی دەرامەت نادەن.
- ڕێگاوبانی سەرەکی: ٩٦٢ کم قیر، ١٥ کم قیرنەکراو.
- بەندەر: بەندەری ئەپرا Apra harber.
- شار و شارۆچکە: ئەگانا Agana (پایتەخت)، تامونینگ Tamuning پێگۆ Pego، ئاگات Agat مێریزۆ Merezo.

## چەردەیەك لە مێژووی گوام

- چەمۆڕۆی کۆن:

دانیشتووانی گوام پێیانوایە باوباپیرانیان دوو هەزار ساڵی پێش مەسیح لە هندستان و مالیزیاوە هاتوون و زمانەکەیان لە گرووپی زمانەکانی مالیزیا، ئیندۆنیسیا و فلیپینە. یەکەم کەسی ڕۆژئاوایی کە باسی چەمۆڕۆی کردبێت لە ساڵی ١٥٢١دا پیگافێتای مێژوونووسی گەشتی دەریایی فەردیناند ماجەلان بووە کە بە دەریادا چواردەوری گۆی زەوی گەڕاوە. چەمۆڕۆ میللەتێکن بە ڕاوەماسی و باخدارییەوە خەریکبوون و شارەزای دەریا و دەستڕەنگینی کارامە بوون لە گۆزەکاری و کەشتیوانی و خانووی جیاکاردا کە بۆ ئەم ژینگە و ناوچەیە بگونجێت. چەمۆڕۆ بە قۆناخێکی بەهێزی دایکسالاریدا

تێپەڕیون و ژن بایەخێکی گەورەی هەبووە لەم کۆمەڵگایەدا و داگیرکەر ئیسپانەکان درکیان بەم ڕاستییە کردووە و ئەمەش وایکردووە کەوا فەرهەنگی چەمۆڕۆ بە زمان و گۆرانی و سەما و نەریتیانەوە تا ئەمڕۆ بە زیندوویی بمێنێتەوە.

- **چەرخی داگیرکردنی ئیسپانی ١٥٦٥ ـ ١٨٩٨**

یەکەم پەیوەندیی دوورگەی گوام و ڕۆژئاوا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕۆژەی کەوا فەردیناند ماجەلان بە سێ کەشتییەوە لە ٦ ی مارتی ١٥٢١ و لە کەنداوی ئوماتاگی دوورگەکەدا لەنگەری گرت، کاتێ کە بە چواردەوری جیهاندا گەشتی دەریایی دەکرد. لەم کاتەدا چەمۆڕۆ پەلاماریاندان و خەریکبوو لەناویانبەرن بەڵام گرمەی تۆپە گەورەکانی ترینیداد ترساندنی و ناچاری پاشاکشێی کردن بۆ بێشە و جەنگەڵستانی دەورووپشت.

گوام و دوورگەکانی تری ماریانا لە ساڵی ١٥٦٥ دا بە ڕەسمی خرانە ژێر ڕکێفی تاجی پاشایەتیی ئیسپانیاوە. لە ساڵی ١٦٦٨ دا مسیۆنێرە مەسیحییەکان بە ڕابەریی سان ڤیتۆرس گەیشتنە گوام و مۆرکی ئەورووپایی شارستانی و مەسیحییەت و بازرگانییان تێدا دامەزراند. ئیسپانەکان چەمۆڕۆیان فێری کشتوکاڵی گەنمەشامی (زوڕات) و بەخێوکردنی ئاژەڵ و ڕەشەوڵاخ و خۆشەکردنی پێستە کرد. بەم جۆرە مەسیحییەکان گوامیان کردە پردی هاتوچۆی ئۆقیانووسی پاسیفیك لە مەکسیکەوە بۆ فلیپین.

بە درێژایی ساڵانێکی دوورودرێژ چەمۆڕۆ لەگەڵ هێزە داگیرکارە ئیسپانەکاندا کەوتنە شەڕی بەردەوامەوە و بەجارێ قڕیان تێکەوت، تا وایلێهات لە ساڵی ١٧٤١ دا لە کۆی زیاد لە ١٥٠ هەزار کەس پێنج هەزاریان مانەوە کە زۆربەیان ژن و منداڵ بوون و ناچار کران لە پێنج گوندی دوورگەکەدا: ئەگانا، ئەگات، ئوماتاك، پاگۆ، فێنا بمێننەوە لە ژێر چاودێریی توندی قەشە و سەربازدا و بەزۆر هەموو ڕۆژێ دەیانبردنە کەنیسە بۆ فێربوونی زمان و دابونەریتی ئیسپانی. هەروەها سەربازی ئیسپانی و خەڵکی فلیپینیان دەهێنا بۆ ئەوەی تێکەڵیان بن و بەمجۆرە کۆتاییان بە "خوێنی پاك" ی چەمۆڕۆ هێنا. لە ساڵی ١٧٤٠دا زۆربەی چەمۆڕۆی دوورگەکانی

ماریانای باکووریان ڕاگواست بۆ گوام. ئەم دوورگەیە نزیکەی ٣٥٠ ساڵ لە ژێر دەسەڵاتی ئیسپانیادا مایەوە و تا ئێستاش کاریگەرییەکی زۆری کولتووری ئیسپانیی بەسەرەوەیە.

- **چەرخی بەستنەوە بە ئەمەریکا تا ئەمڕۆ ١٨٩٨ ـ تا ئێستا:**

بە پێی ڕێکەوتننامەی پاریس و لە ئەنجامی جەنگی ئەمەریکا – ئیسپانیاوە لە ساڵی ١٨٩٨دا ئەمەریکا بە ڕەسمی گوامی لە ئیسپانیا کڕی بە ٢٠ ملیۆن دۆلار و لەم کاتەدا دانیشتوانی گوام ١٠ هەزار کەس بوون و لەو کاتەوە گەلێ بواری گەشەکردنی بەخۆوە دیوە.

لە کاتی جەنگی جیهانی دووەم و لە ١٠ ی دیسەمبەری ١٩٤١دا هێزەکانی ژاپۆن گوامیان داگیر کرد و ماوەی ٣١ مانگ بەمجۆرە مایەوە و نزیکەی ٦٠٠ کەسی چەمۆڕۆی لە سێدارەدا.

لە ٢١ ی تەمووزی ١٩٤٤دا هێزەکانی ئەمەریکا بە خەستی بۆمبارانی دوورگەکەیان کرد و هەزاران کەسی ژاپۆنی و چەمۆڕۆ گیانیان لەدەستدا و لە پاش هێرشێکی توند گرتیەوە و ئەنجام کوژرانی حەوت هەزار سەربازی ئەمەریکی و یانزە هەزار ژاپۆنی لێکەوتەوە و هێزەکانی ژاپۆن تێکشکان و تاکوتەرایەکیان مایەوە لە دوورگەکەدا پەرتوبڵاو بوونەوە، کە سێرجنت شۆیچی یۆکۆی یەکێك بوو لەوانە و ماوەی ٢٨ ساڵ لە ئەشکەوتێکی دوورگەکەدا خۆی شاردەوە.

گوام ئێستا یەکێکە لە گەورەترین بنکەی سەربازیی ئەمەریکا لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و ئۆقیانووسی پاسیفیکدا.

تا ئێستاش گوامییەکان شانازیی بە ئەفسانە و فۆلکلۆریانەوە دەکەن و لە گەلێ بواری ژیاندا پاراستوویانە وەك دەست ماچکردنی بەساڵداچووان، ئەفسانە، گۆرانی، سەما، نەریتی یەکتر دواندن، کاری دەستڕەنگینی، ڕێوڕەسمی مردوو ناشتن، بەکارهێنانی گژوگیا وەك دەرمان و داوای بەخشین لە ڕۆحی باوباپیران کاتێ کە دەچنە ناو بێشە و جەنگەڵەوە. ئێستاش چارەنووسی ئەو دوو دڵدارەی لە لووتکەی چیاوە خۆیان هەڵدا دەریاوە و خنکان بابەتێکی تایبەتە لە کولتووری چەمۆڕۆدا. کوڕەکە ناوە پونتان دۆس

ئەمانتێس و کچەکەش شیرێنا، کەوا کیژێکی جوان بووە و لە ئەفسانەیاندا بووە بە حۆریی دەریا.

مانەوەی ئیسپانیا لە گوامدا بۆ ماوەی ٣٥٠ ساڵ کاریگەرییەکی زۆری بەجێهێشتووە و بە تایبەتی کەنیسەی کاسۆلیکی لە سەدەی حەڤدەوە ڕۆڵی خۆی بینیوە.

---

** تێبینی: بێجگە لە گوام نزیکەی دە دوورگەی تر هەن لە دەڤەری ماریانای باکووردا، هەر یەکەیان بە قەبارە و ڕووبەر و دانیشتووان لە گوام بچووکترن و تێکڕا ڕووبەریان ٤٧٧ کیلۆمەتری چوارگۆشەیە و دایشتووانیان نزیکەی هەشتا هەزار کەسە و بە سیستەمی بەڕێوەبردنی کۆمنوێلس جۆرە فیدراڵییەت و سەربەخۆییەکیان هەیە بەلأم لە ژێر ڕکێفی ویلایەتە یەکگرتووەکاندان.

دوورگەکان ئەمانەن: سایپان Saipan (کە لە هەموویان گەورەترە و شاری تینیانی پایتەختی دوورگەکان دەکەوێتە ئێرە)، ڕۆتا Rota، ئەناتاهان Anatahan، گوگوان Guguan، پاگان Pagan، ئەگریهان Agrihan(دوو لووتکە چیای بەرز لێرە هەن هەر بەم ناوانە و بورکانیان لە سەرە و گەڵ جار دەتەقنەوە)، ئەسانسیۆن Acancion، ماوگ Maug تاد..

# لووتکەی دوو دڵخواز و ئەشکەوتی عەریفە ژاپۆنییەکە

لە چیرۆکە سەیر و سەمەرەکانی دوورگەی گوام: کەمێك دوور لە شوێنەکەی ئێمەوە لووتکە شاخێك بە ڕاسەری پاسیفیکەوە بوو پێیاندەوت لووتکەی دوو دڵخواز یان دوو ئاشق و دەگێڕنەوە کەوا لە زەمانی کۆنی دوورگەکەدا کاتێ لە ژێر دەستی ئیسپانیادا بووە فەرماندەیەکی هێزی دەریاوانیی ئیسپانی لەوێ کەڵکەڵەی ژنهێنانی دەکەوێتە سەر و دەستوپێوەندیش کچێکی جوانی جووتیارێکی هەژاری دوورگەکەی بۆ دەدۆزنەوە و باوکی ڕازی دەبێت و شیربایی مۆڵی خۆی وەردەگرێت، بەلام کچەکە کوڕە هەژارێکی خۆشدەویست و بەم شووکردنە قایل نابێت و کاتێك بێ خواست و ڕەزای خۆی دەیگوێزنەوە بۆ فەرماندە، کە بەوپەڕی کەیفخۆشییەوە خۆی بۆ شەوی زاوابوون ئامادە دەکات، گوایە بووکی رازاوەی خەیاڵ لەئامێز بگرێت، کەچی هەر ئەو شەوە کچە لە گەڵ کوڕە دڵخوازەکەی خۆیدا دەچنە سەر ترۆپکی ئەو لووتکەیە و خۆهەڵدەدەنە نێو ئاوی ئۆقیانووسی پاسیفیکەوە و دەبنە قوربانی خۆشەویستییەکەیان. کوڕەکە ناوی پۆنتان و کیژە جوانەکەش ناوی سیرێنا دەبێت و بە پێی ئەفسانەی گوامییەکان تا ئێستاش لە شێوەی حۆریی دەریادا خۆی دەنوێنێت.

چیرۆکێکی تری خۆشتر کە بە واقیع ڕوویداوە. لە باکوری دوورگەکەدا ئەشکەوتێك هەیە پێی دەڵێن ئەشکەوتی عەریف شۆیچی یۆکۆی Shoichi Yokoi. وەك پێشتر ئامازەم بۆ کرد ژاپۆن لە گەرمەی جەنگی جیهانیی دووەمدا ماوەی ٣١ مانگ (١٩٤١ – ١٩٤٤) ئەم دوورگەیەی داگیرکرد و ساڵی ١٩٤٤ ئەمەریکا پاش شەڕێکی قورس سوپای ژاپۆنی لێرە تێکشاندووە و ئەوی ڕایکردووە دەرباز بووە و ئەوی کە ماوەتەوە بە نەریتی هاراکیریی ژاپۆنیەکان خۆی هەڵداوەتە ئاوی زەریاوە و خنکاوە. پاش ئەو شەڕە ئەمەریکا گوامی گرتەوە. عەریفێکی سوپای ژاپۆن کە ناوی شۆیچی یۆکۆی دەبێت خۆناداتە دەستەوە و لە بەشی باشووری دوورگەکە و لە ناو جەنگەڵ و دارستانێکی چڕ و بێشەلاندا لە سەر چەمێك کە پێی دەڵێن تالۆفۆفۆ کونێك هەڵدەدرێ بە لقی دار حەیزەران دەیتەنێت و دوور لە چاوی خەڵك و ئاوەدانی ژیانی تێدا دەگوزەرێنێت و لە سەرخواردنی گژوگیا و بەری دار و درەخت و مشك و مارماسی هێلکە شەیتانۆکە دەژی، جلوبەرگیش لە تویکڵەدار بۆ خۆی دروست دەکات، چونکە پێشتر بەرگدروو بووە لە وڵاتی خۆی.

ئەم پیاوە ماوەی بیست و هەشت ساڵ لەم کونە ئەشکەوتەدا خۆی دەشارێتەوە و کەس پێی نازانێ تا لە ٢٤ کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٧٢دا دوو ڕاوچی دەیدۆزنەوە و بە ئامادەبوونی کونسوڵی ژاپۆن لە گوام لێکۆڵینەوەی لە گەڵ دەکرێت و دەردەکەوێت پاش هەشت ساڵ لە پارچە کاغەزێکی دۆزراوەدا هەواڵی کۆتایی جەنگی خوێندووەتەوە بەلام باوەڕی پێنەکردووە و هەر بە تەما بوو سوپای ژاپۆن دوورگەکە بگرێتەوە و ڕزگاری بکەن. شیاوی باسە لە کاتی دۆزینەوەیدا پزیشك فەحسی دەکەن و بە سەرسامییەوە تەماشا دەکەن تەندروستیی زۆر باشە. ئەم ڕووداوە کاتی خۆی لە سەر شاشەی تەلەفزیۆن بەزم و ڕەزمێکی خۆشی دروست کردبوو.

پاشان یۆکۆی دەبەنەوە بۆ ژاپۆن و ئاهەنگی گەورەی بۆ ساز دەکەن و بوو بە قارەمانی جەنگ و هاولاتیانی بایی نزیکەی هەشتا هەزار دۆلار دیاری و خەلاتی پێدەبەخشن و پارەشی بۆ کۆدەکەنەوە و خانوویەکی بۆ دەکڕن و خاتوو میهۆکۆ هاتاشین دەخوازێ، چونکە پێشتر ژنی نەهێنابوو و کاتێ دۆزراشەوە تەمەنی ٥٨ ساڵ بوو. ساڵی ١٩٩١ ئەکیهیتۆی ئیمپراتۆری ژاپۆن بە ڕەسمی چاوی پێدەکەوێت. شیاوی باسە تا هەشت ساڵ پێش دۆزینەوەی یۆکۆی دوو سەربازی تری پەراگەندەی ژاپۆنی، بە ناوی جیجی و ناکاهادا، لە ئەشکەوتێکی تری نزیکی ئەوەی ئەمدا خۆ دەشارنەوە و سەردانی یەکتر دەکەن. بەلام دواتر ئەمان لە برسا دەمرن و ئەم بە تاقی تەنها دەمێنێتەوە. یۆکۆی ساڵی ١٩٩٧ لە تەمەنی ٨٢ ساڵیدا بە نەخۆشیی دڵ کۆچی دوایی دەکات لە گۆڕستانی شاری ناگۆیای زێدی لە پاڵ گۆڕی دایکیدا دەنێژرێت.

تا ئێستاش هەر کەسێك سەردانی گوام دەکات دەچێتە سەر ئەو شوێنەی یۆکۆی خۆی تێدا شاردبۆوە و لە مۆزەخانەی شاری ئەگانای پایتەختیشدا تەواوی ئەو کاسە و کەویلە دارین و کانزاییانە پیشاندراون کەوا یۆکۆی لە ماوەی ٢٨ ساڵی خۆشاردنەوەکەیدا بەکاریهێنابوو.

# لە گوامەوە بۆ ئەمەریکا.. بە سەر ئۆقیانووسی پاسیفیکدا

وا زیاد لە سێ مانگە لە دوورگەی گوامین و خەڵکەکە بەتەواوی بێزارن و کەس نازانێ لەو وڵاتە پان و پۆڕەی ئەمەریکادا چی بەسەردێت و چۆن دەژی. هەریەکە قسەیەك دەکات و ئەو وەرگێڕە کوردانەی لەوێوە هێنابوونیان بۆ کاری وەرگێڕان و ڕاپیکردنی موعامەلاتی خەڵك گەلێکیان بووبوون بە دۆستمان. یەك لەوانە هونەرمەندی سینەماکار جانۆ ڕۆژبەیانی بوو کەوا مایەی پێزانینە خزمەتی کردم و گەلێ نامەی بۆ گەیاندم و زۆری حەز دەکرد کالیفۆرنیام بەربکەوێ، چونکە خۆی لەوێ دەژیا و هاوکاری هۆلیوود بوو، هەروەها حەزیشی دەکرد سوود لە کتێبی "جینۆساید لە عێراقدا و پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد" وەربگرێ بۆ بەرهەمهێنانی فیلمێك لە سەر ئەنفال. بەلام بەداخەوە ئەو ویلایەتەم بەرنەکەوت و لە گوام بەدواوە هەواڵی کاك جانۆم نەزانی.

لەوێ، واتە لە گوام، دەکرا پەیوەندی بە خزمێکت یان دۆستێکتەوە بکەیت کە پێشتر لە ئەمەریکا نیشتەجێ بووبێت بۆ ئەوەی ببێتە سپۆنسەرت، یان بە پێی کولتووری ئیداریی لای خۆمان شێوە کەفالەتێکت بکات. ئەگەریش کەسی وات شك نەبردایە دەکرا چەند کەسێکی خزم و دۆست ناویان بە یەکەوە بنووسیایە بۆ ئەوەی پێکەوە بەر یەك شوێن بکەون و دواتر دەرکەوت لە دەزگای کۆچی ئەو وڵاتەوە زۆر کاریان بەمەی دوایی کردووە. من یەکەمجار پەیوەندیم کرد بە کاك تیشکۆ زەندەوە، کە دۆستی کوڕێکی ژنبرام بوو، بەڵام من نەمدیبوو و نەمدەناسی. خواهەڵناگرێ زۆر پیاوانە بەدەممەوە هات و بەڵێنی دا ببێتە سپۆنسەرم و ڕامکێشێ بۆ کالیفۆرنیا، کە خۆیشی لەوێ بوو. هەر لەو دەمەشدا پەیوەندیم کرد بە هاوڕێیەکی سەردەمی قوتابێتیمەوە لە کفری، کە ناوی عەلی زەندی بوو و لە ساڵی ١٩٧٦ەوە پەراگەندەی ئەو وڵاتە و لە شاری ساندیاگۆی باشووری کالیفۆرنیا نیشتەجێ بووبوو. کاك عەلی بە دەستوورێکی عەشایەرانە و کوردانەی لای خۆمان پێی وتم عەیبە تۆ تەلەفۆنت بۆ خەڵکیتر کردووە ببێتە سپۆنسەرت ئەی من چیم لێرە، خۆم هەموو کارێکت بۆ مەیسەر دەکەم و هەقت نەبێ. ناچار منیش بە سوپاسەوە سپۆنسەرییەکەی کاك تیشکۆم ڕەتکردەوە و بە تەمای کاك عەلی دۆستم بووم.

دەبێ ئاماژە بۆ ئەوە بکەم کەوا زۆربەی خەڵکەکە لە گوام کالیفۆرنیایان نووسیبوو، لەبەر ئەوەی ویلایەتێکی خۆشە و چوار وەرزە بەهارە. بێجگە لەوەش کاروباری سۆشیاڵ

لەم ویلایەتەدا وەکو ئەوروپا وایە و ئەگەر کاریش نەکەیت ژیانت هەر مسۆگەرە. ئەوجا لەو شارەشدا "ساندیاگۆ" کە من بەتەمابووم بۆی بچم وەك باس دەکرا کوردێکی زۆری سالانی پێشتری لێ دەژیا و لەوێ کەمتر هەستت بە غەریبی دەکرد.

لە گوام هەر دوو سێ ڕۆژ جارێك وەجبەیەکی ٨ – ٩ خێزانییان دەگواستەوە و ئەوی ناوی دەهاتەوە زۆر خۆشحاڵ دەبوو. کاتی خواحافیزیش خۆشی و گریان تێکەڵ دەبوون و ئەوی دەڕۆیشت ئیتر هەواڵمان نەدەزانی، چونکە وەك پێشتر باسم کرد لە سەرێکەوە هۆکاری پەیوەندیی وەك ئێستا نەبوو لە سەرێکی تریشەوە لەبەر ئەوەی گوام دوو پێگەی زۆر گەورەی هێزی دەریایی و ئاسمانی ئەمەریکای لێبوو بە هۆی بارودۆخی ئەمنی سەربازییەوە پەیوەندیکردن ڕەها نەبوو.

ئێمە زۆر دڵمان بەوە خۆش بوو کالیفۆرنیا چاوەڕێمان دەکات و زۆر لە برادەرەکانم بەغیلییان پێدەبردم کە دۆستێکی وەك کاك عەلی زەندیم لەو وڵاتە هەیە. ڕۆژی ٢٥ ی مارتی ١٩٩٧، هەواڵیان داینێ خۆمان کۆبکەینەوە و بەیانیی زووی ٢٦ ی مانگ خۆمان و جل و جانتایان بردین بۆ فڕۆکەخانەی گوام و کاتێ تەماشامان کرد بە خەتی گەورە لە سەر جانتاکان نووسراوە "ATL" و کاتێ پرسیارمان کرد ئەمە چ شوێنێکە وتیان شاری ئەتلەنتای ویلایەتی جۆرجیایە و بەجارێ نیگەران بووین، باشە خۆ ئێمە بە تەمای ساندیاگۆ ـ کالیفۆرنیا بووین، گوایە بۆچی وایلێهات! بەهەرحاڵ تازە چارنیە و بەیانیی زووی ئەو ڕۆژە گوامەمان بەجێهێشت و بە سەر شینایی ئاوی ئۆقیانووسی پاسیفیکدا دەفڕین و دڵەڕاوکێ و نیگەرانی سەرتاپا مێشکی گوشیبووین. فڕۆکەکەمان یانزە هەزار مەتر بەرزبووبۆوە. کاتێ تەماشای شینایی خوارەوەمان دەکرد زەندەقمان دەچوو، چونکە ئەو پاپۆڕانەی لە گوام دەمانبینین بە قەد کەژێك دەبوو، لە ئاسمانەوە بە قەد چۆلەکەیەکیان دیاربوو. باشە بۆ ATL و کێ لەوێ چاوساغمان دەبێت و کێ بە هانای غەریبی و پەڕاگەندەییمانەوە دێت! ئێمە بیستبوومان لە سەر خاکی ئەمەریکا کەنیسە و ڕێکخراوی خۆبەشی زۆر بۆ یارمەتیدانی پەنابەر هەن و ئەوەشمان دەزانی کە هی وایان تێدایە باشە و جێگە و ڕێگەی گونجاوت بۆ دابین دەکەن و هەشیانە لە ژوورێکی ڕەق و تەق بەولاوە هیچی ترت بۆ دابین ناکەن و ڕۆحمان لەمەیان چووبوو. بەڵام چارچیە چی دەبێ بابێ، خۆمان بە خۆمانمان کردووە و کەس زۆری لێنەکردووین.

ماوەی نزیکەی حەوت سەعات بە ئاسمانەوە بووین و لەپڕ لە تاقمی فڕۆکەکەوە ئاگادارییەك بڵاوکرایەوە کە لە دوورگەکانی هاوای نزیکبووینەتەوە و خۆتان ببەستنەوە

کەمێکی تر لە فڕۆکەخانەی شاری هۆنۆلۆلۆی هاوای دادەبەزین. هۆنۆلۆلۆ Honolulu جوانترین شاری سەر ئەرزە لە ئاسمانەوە بینیبێتم، زۆربەیماڵەکانی شارەکە بە لاپاڵی شاخێکی بەرزی پڕ داروبارەختەوە چین لە سەر چین دروستکراون و تا چاو بڕبکات جزیرەکە شاخ و سەوزایی و دارە. ماوەی چوار پێنج سەعاتێك لە فڕۆکەخانەی هۆنۆلۆلۆدا ماینەوە و لێرە فڕۆکەکەیان گۆڕین و خۆشمان نەمانزانی چۆن جانتاکانیان گواستەوە بۆ فڕۆکەیەکی تر. لێرەدا بۆیە باسی گواستنەوەی جانتا دەکەم، چونکە دواتر کە گەڕاینەوە بۆ کوردستان لە فڕۆکەخانەی ئەستەمبوولدا بە جۆرێك مامەڵەیان لەگەڵ گواستنەوەی جانتادا دەکرد، کە زیاتر لە خان دەچوو نەك فڕۆکەخانە. ئەمجارەیان سێ یان چوار خێزان بووین و گوێزراینەوە فڕۆکەیەکی گەورە کە چەند سەد کەسێکی تێدابوو، زۆربەیان کوڕ و کچی گەنج بوون سەیرانی هاواییان کردبوو دەگەڕانەوە. ئەمجارەشیان حەوت سەعات بە ئاسمانەوە بووین تا گەیشتینە ویلایەتی کالیفۆرنیای ڕۆژئاوای ئەمەریکا و لە فڕۆکەخانەی شاری سان فرانسیسکۆی بە ناو و شۆرەتی ئەو وڵاتە نیشتینەوە و لێرەش وەك هاوای کەسانێك پێشوازییان کردین، کە سەر بە دەزگای کۆچی ئەمەریکی بوون INS و وردەکاریی بەرنامەی گەشتەکەی ئێمەیان لابوو. ئێمە شەو گەیشتین و خێرا بردینیان بۆ ئوتێلێکی قەشەنگی ئەو شارە کە ناوی ڕێد ڕووف Red Roof بوو جێگەی حەوانەوە و خزمەتی باشیان بۆ دابینکردین و ڕێبەرەکە پێی وتین سبەی نیوەڕۆ دێمەوە شوێنتان و لە فڕۆکەخانەوە ڕەوانەی جۆرجیاتان دەکەین. شەو لە ئوتێلەکەوە تەلەفۆنم کرد بۆ عەلی زەندی لە ساندیاگۆ و پێم وت کاکە بەر جۆرجیا کەوتووین تۆ بۆچی دەستت پڕین، نە خۆت پیاوەتیت پێکرا و نە هێشتت خەڵکی تریش ببنە سپۆنسەرمان. زۆری پۆزش بۆ هێنامەوە گوایە چووەتە دەزگای کۆچی ئەو شارە قرە و دەماقاڵەی لەگەڵ کردوون و مەسەلەکە لە دەستی ئەودا نەماوە و کالیفۆرنیا چونکە زۆر داخوازیی لە سەرە بەرمان نەکەوتووە و زۆر خۆی سەغڵەت کردبوو کە هەوڵدەدا لە جۆرجیاوە بمانگێڕێتەوە بۆ کالیفۆرنیا. بەهەرحاڵ من دواتر زانیم کە درۆکردن لە ئەمەریکادا ئاوخواردنەوەیە و کاك عەلی نزیکەی چارەکە سەدەیەك بوو لە وڵاتی خۆمان هەڵکەنرابوو و سەرباری ئەوەش ژنێکی مەکسیکیی هێنابوو. بێجگە لەوەش لە دەزگای کۆچەوە وابزانم لە سپۆنسەریان دەپرسی ئەگەر بۆمان نەلوا جێگە و ڕێگە بۆ ئەم خێزانە دابین بکەین تۆ دەتوانی بیانبەیتە لای خۆت؟ ڕەنگە کابرا لێرەدا دوودڵییەکی دەربڕیبێت، یاخوا کەس لە ئاوارەییدا ئەم دەردەی بەسەر نەیەت. بۆ نیوەڕۆی ڕۆژی دواتر ڕێنماکە پاسێکی بچکۆلەی هێنایە شوێنمان و ئێمە سێ خێزان مابووینەوە: ماڵی ئێمە کە شەش کەس بووین و بۆ جۆرجیایان دەناردین لەگەڵ ماڵی کوردە خان و باوك و دایکی و برایەکی و خێزانێکی تر

باشم نەدەناسین و لە گوامەوە بووبوونە هاورێگەمان و بۆ شاری دێنڤەری ویلایەتی کۆلۆرادۆیان دەناردن. لە فرۆکەخانە تا دوای نیوەڕۆیەکی درەنگ چاوەڕێ بووین، فرۆکەخانەی چی شارێك بوو بۆ خۆی، سەدان کەس دەهاتن و دەچوون. من خۆم وەك کوێر نەشارەزا بووم تەماشا دەکەم ژنێکی چینی ونبووە و بە ئینگلیزییەکی شەقوشڕ قسەم لەگەڵ دەکات کە پتر لە چینی دەچوو نەك ئینگلیزی و دەیەوێ بیبەمە ئەو بیرۆیەی ئیشەکەی بۆ ڕایی دەکەن، کاری ڕاست بێت پۆلیسێك خۆبەخشانە بوو بە ڕێنمای و لە کۆڵی منی کردەوە. بۆ دوای نیوەڕۆ چووینە فڕۆکەیەکی مامناوەندییەوە کە بۆمان دەسنیشان کرابوو و بەرەو شاری هیوستن دەڕۆیشت لە ویلایەتی تەکساس. من پێشتر بیستبووم خەڵکی تەکساس مڕومۆچن، هەرواشبوو ئەو تەکساسیانەی لە فڕۆکەکەدا بینیمن هەموو ڕووگرژ بوون و بزەیەك نەدەکەوتە سەر لێوی کەسیان. لە هیوستن نزیکەی سێ چوارسەعاتێك ماینەوە پاشان بەڕێکەوتین بەرەو ئەتڵەنتا و تێکڕا نزیکەی شەش سەعاتێك بە ئاسمانەوە بووین و دەمەوبەیانییەکی زوو گەیشتینە فڕۆکەخانەی هارتسفیلد لە ئەتڵەنتا و تەماشامان کرد برادەرێکی کوردی هەولێری کە ناوی شیروان بوو لەگەڵ ماڵی کاك ئازاد و ئاشنا خانی خێزانی و تەلار خانی خوشکی و ئاریانی برای و کۆمەڵێك ژن و پیاوی ئەمەریکی لە پێشوازیماندان. ئەم ماڵە لە سەری ژنەوە خزمایەتییەکیان لە گەڵمان هەبوو و چەند ڕۆژێك پێش ئێمە گەیشتبوون. کاك شیروان کۆمەڵەکەی پێناساندین کە سەر بە کەنیسەی ئیپیسکۆپاڵ Episcopal بوون کە لە چوارچێوەی ڕێکخراوی کەنیسە لووسەرییەکانی جۆرجیادا Lutherian Ministries Georgia بوون. ئەمە مستەر سنۆ و سارای ژنێتی، مستەر ڕیچارد و سوزان پێرشینگی خێزانی، مستەر لاری و سوزان شۆدرۆڤسکی، خاتوو شێڵبی و بۆبی هاوسەری، خاتوو میشێڵ و ڕۆبەرتی هاوسەری، مستەر لویس و لیندای خێزانیو چەند کەسێکی تر. هەموو زۆر بە گەرمی بەخێرهاتنیان کردین و پێیانڕاگەیاندین کەوا لەخزمەتماندا دەبن تا چاو دەکەینەوە و کارمان بۆ دەدۆزنەوە. ڕاست.. درۆ، ئێمە بە تەمای ئەم پێشوازییە نەبووین و کاك شیروان زۆری دڵداینەوە کە کۆمەڵە خەڵکێکی باشمان تووشبووە و خەممان نەبێت. پاش کەمێك حەوانەوە لە فڕۆکەخانەدا سواری پاسێکی بچکۆلەیان کردین و خۆشیان بە مەوکیبی ئۆتۆمبێلەکانی خۆیان شوێنمان کەوتن و ماوەی نیو سەعاتێك بەڕێوەبووین و هێشتا مەلای بەیانی بانگی نەدابوو، بووین بە میوانی ماڵی مستەر کلۆد سنۆ.

# ویلایەتی جۆرجیا و میوانە کوردەکانی ماڵی مستەر سنۆ

مستەر سنۆ یەکێك بوو لە دەوڵەمەندەکانی ئەو ویلایەتە و ماڵە گەورەکەی دەکەوتە شارۆچکەیەکی نزیك ئەتڵەنتاوە کە ناوی ڕۆزوێلّ Roswell بوو، لە شوێنێکی تەریك و لە ناو باخێکی گەورە و پانوپۆڕدا، چەشنی گەلێك لە ماڵە دەوڵەمەندەکانی ئەو ولاتە. خانووەکە دوونهۆم و گەورە و لە تەختەدار دروستکرابوو. بۆ ئێمە دوو ژووریان لە نهۆمی دووەم ڕازاندەوە و چوار منداڵەکەم لە ژوورێکدا، من و دایکیشیان لە ژوورێکدا بە هەموو پێداویستییەکانی حەوانەوەوە. بە هەمان دەستوور ماڵی خزمەکەشم ژوورێك بۆ ژن و مێردەکە و ژوورێکی تریش بۆ خوشك و براکە ڕازێنرایەوە. لە پاش بەرچاییکردن داوایان لێکردین داب و دەستووری نانخواردنی خۆمانیان بۆ باس بکەین و بە پێی ئەوە درێغییان نەدەکرد لە خزمەتکردنمان و زۆربەی ژنەکانی سەر بەو کەنیسەیە ڕۆژانە لە بەیانیی زووەوە تا شەو بە دەممانەوە دەبوون و دەیانبردین بۆ پیاسە و ڕێستۆرانت و شوێنی گەشتوگوزار.

حەز دەکەم لێرەدا باسی ئەوە بکەم کە لەم ولاتەدا، وەك پێشتر ئیشارەتێکم بۆ کرد، گەلێ لە کەنیسە و ڕێکخراوی خۆبەخش هاوکاریی دەزگای کۆچ INS و حکومەتی فیدراڵیی ویلایەتە یەکگرتووەکان دەکەن بۆ ڕاهێنان و نیشتەجێ کردنی پەنابەر و پاشانیش کار دۆزینەوە بۆیان و دەسگرۆیی کردنیان تا سەر پێی خۆیان دەکەون و چیتر پێویستیان بە خەڵك نامێنێ. پێموابێ ئەم ڕێکخراو و کەنیسانە بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە پارەیەك لە حکومەتی ئەمەریکی وەردەگرن، جا هەیانە بە ویژدانەوە خەرجی دەکەن و پارەی گیرفانی خۆشیانی دەخەنە سەر، هەشیانە فڕوفێلّ و چاوبەستی دەکەن و پارەکە بۆ خۆیان دەبەن. لەم ڕووەوە ڕێکخراوە خۆبەخشە ئاسیایی و بەتایبەتی ڤێتنامیەکان ناوبانگیان خراپە. قسەی خۆشمان بێت ڕێکخراوێکی کوردیش هەبوو لە ڤەرجینیا و واشنتۆن کە خانمێکی کورد بەرپرسی بوو دەیانگوت لە ڤێتنامیەکان زۆر خراپتر بووە. ئالێرەوە وەلامی ڕاستەقینەی ئەو پرسیارەی گوامان دەستکەوت کە

ڕێکخراو هەیە مقەبا شرەیەکت پێ ڕەوا نابینێ و هەشە کورد واتەنی خەنیت دەکات. ئەوەی ئێمە خۆشبەختانە دەستنوقاو نەبوون بەلام خەنیشیان نەکردین وەك لە هەندێ ویلایەت ڕوویدا کەوا هاوقەدەرە کوردەکانمان بە سەر خێر و بەرەکەتی باشدا کەوتن. سەبارەت بە کەنیسەش، لەم ولاتەدا دەیان مەزەب و ڕێبازی مەسیحییەت وەك باپتیست و مێتودیست و لووسەری و ئیپیسکۆپاڵ و تاد، کە زۆربەی زۆریان پرۆتستانتن و لە زەمانی زەبروزەنگی کەنیسەی کاسۆلیك و پاپا و دادگاکانی پشکنیندا باوباپیرانیان لە دەست زوڵم و زۆری کەنیسە لە ئەورووپاوە هەڵهاتوون بۆ ئەمەریکا و لێرە بە سەربەستی ڕێوڕەسمی ئاینیی خۆیان پراکتیزە کردووە. ئەمانە ئێستا هەر یەك بە ڕەنگێ ڕۆڵی خۆی دەبینێ لەجێگیرکردنی پەنابەردا. هەیانە تەنها مەبەستی مرۆڤدۆستییە و هیچیتر، هەشیانە لەپاڵ ئەو مەبەستەدا مسیۆنێرن (تەبشیرین) و دەخوازن خەڵك بچێتە سەر دینیان و گەلێ لەخەڵکی باشوور و ڕۆژهەلاتی ئاسیا و ولاتانی ئەفریقا، لەوانەی بوودین یان هەر لە بنەڕەتدا بێدینن دەبنە مەسیحی. بەلام کەم کەسی خەڵکی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست یان ئەوانەی بە ئاین ئیسلامن ئەو کارە دەکات و ئەگەریش هەندێ کەسی هەلپەرست و بەرژەوەندخوازی لەو بابەتە هەبن ئەوە جێی بێزلێکردنەوەی ئەودوای خەڵکەکەن.

ڕاستێکەی ئەندامانی ئەو کەنیسەیەی دەسگرۆیی ئێمەیان دەکرد لە مرۆڤدۆستی بەولاوە هیچم لێنەبینین و تەنانەت ژنێکیان پێیوتین ئێمە ڕۆژانی یەکشەممە دەچینە کەنیسە بۆ نوێژ و پاڕانەوە، بیستوومە ئێوەش ڕۆژانی هەینی ئەو ڕێوڕەسمەتان هەیە، ئەگەر دەتانەوێ من دەتانبەم بۆ ئەتڵەنتا و لەوێ مزگەوتی موسوڵمانی لێیە نوێژی خۆتان بکەن. ماڵتان ئاوا پێویست بە ئەزێتدانتان ناکات و ئەگەر هەر کەسێکمان نوێژ بکات لە ماڵی خۆیەوە دەیکات. لە ناو ژنانی ئەو گرووپەی بەدەممانەوە بوون زیاتر شێلبی، میشێڵ، سوزان پێرشینگ و سوزان شۆدرۆفسکی و لیندا لویس بەرچاو بوون و هەر یەکە بەکارێکمانەوە خەریك بوون. یەکێك بۆ خانوو بەکرێگرتن و شوێنکەوتنی موعامەلاتمان لە دەزگای کۆچ، یەکێك بۆ کاروباری بازاڕ و یەکێك بۆ مەسەلەی

خوێندن و قوتابخانەی منداڵەکانی من. ماڵی مستەر سنۆ زۆر بە وێڵ و ماریفەت بوون و بۆ هەر ژەمێك لێیان دەپرسین چیمان بۆ بکەن. بەڵام ئەوەی کە زۆر نیگەرانی کردبوون سەگەکەیان بوو. ئەم ماڵە توولە سەگێکی بچکۆلەی ڕەشی گوێ شۆڕیان هەبوو، زۆریان خۆشدەویست و خۆشەویستییەکەیان گەیشتبووە ڕادەیەکی وا کە لە چەندین شوێنی ماڵەکەیاندا وێنە و پۆرترێت و پەیکەری ئەو سەگەیان دانابوو، تەنانەت قاپ و کووپ و پەرداخیشیان وێنەی ئەو سەگەی پێوە بوو. دوو منداڵی تەمەن ٦ و ٨ساڵی من بوون لەو سەگە دەترسان و جاروبار ڕاویاندەنا. سارا خانم کە ئەو سەگەی لە باوکی و بگرە لە حەزرەتی عیساشی زیاتر خۆشدەویست نەیدەزانی چیبکات. ناچار تا ئەو ماوەیەی ئێمە لەوێ میوان بووین سەگەکەی لە ژوورێکی ڕازاوەی ماڵەکەی خۆیاندا دانا. ماڵی مستەر سنۆ زۆر لەوە سەریان سوڕدەما کە ئێمە خێزانێکین و چوار منداڵمان هەیە و پێیان سەیر بوو. ئەوان خۆیان تەنها ژن و مێردێك و کوڕێکی ١٧ – ١٨ ساڵیان هەبوو. کوڕە لەگەڵ کچە هاوڕێکەیدا ڕۆیشتبوو. دەیانگوت کوڕێکی تریش ناوی خێزانی ئێمەی هەڵگرتووە و بە پێی ئاینی مەسیحی ئەوە پێی دەڵێن منداڵی تەعمید و هەر بە ناو منداڵی ئەو خێزانەیە. مستەر سنۆ پیاوێکی تا بڵێی ئەرباب و خۆش مەشرەب بوو. دوو منداڵە بچووکەکەی من لە گوام فێری هەندێ سروودی ئەمەریکی بووبوون بۆیان دەوتەوە و ئەمیش بۆیان هەڵدەقونی و چەپڵەی بۆ لێدەدان. مستەر سنۆ بە ڕەچەڵەك ئێرلەندی بوو و گەلێ شانازیی بە باوباپیرانیەوە دەکرد و ساڵانە ئاهەنگیان ساز دەکرد و هەر بنەماڵەیەك شتی کۆنینەی خۆی بە جلوبەرگ و چەك و کاسە و کەویل و دەستووری ژیانەوە دەخستەڕوو.

لە پاش حەفتەیەك هەر لە شاری ڕۆزوێڵ خانوویان بۆ گرتین و سێ مانگیش کرێیان بۆ داین. ئەوی ئێمە شوقەیەکی قاتی دووەم بوو لە شوێنێکی ئەمینی ئەو شارەدا و مانگانە کرێی شوقەکەم بە کرێی خزمەتگوزاریی کارەبا و ئاو و غاز و تاد.. دەگەیشتە هەزار دۆلار و ماوەی ئەم سێ مانگەش هەفتانە دەهاتنە شوێنمان و چی خواردن و پێداویستیی بازاڕمان بوو بۆیان دەکڕین و ڕۆژانەش

یەك دوانێك لەو ژنانە سەردانیان دەكر ... ،جگە لەوەش هەر كەسێك لە ماڵی خۆی پێداویستییەكی ناوماڵی بۆهێنابین و سەرجەمی جل و پێخەفیشمان بە تازەیی لە بازاڕ بۆ كڕدرا. لەو ماوەیەشدا دەورەیەكیان بۆ كردینەوە بۆ فێربوون و قاڵبوون لە زمانی ئینگلیزیدا و ڕۆژانە بە ئۆتۆمبیلی خۆیان دەیانبردین بۆ دەورەكە. هەر چەندە لە ماڵی ئێمەدا من و لەو ماڵەكەش هەمویان ئینگلیزییەكەمان باش بوو بەڵام دەبوو هەر بچووینایە بۆ ئەو كۆرسە.

ڕاستێكەی ئەوەی مەسیحییەكانی كەنیسەی سانت دێڤیدی شاری ڕۆزوێڵ بۆیان كردین لە هیچ برا و خوشك و خزمێكی ولاتی خۆمان نەدەوەشایەوە. ئەمانە و بەتایبەتی ژنەكانیان، كە گەلێكیان تەنها پیاوەكانیان كاریان دەكرد و ژنەكان بۆ كاروباری خۆبەخشی و خێرخوازی خۆیان تەرخان كردبوو، یەكێك سەرقاڵ بوو بەوەی كارمان بۆ بدۆزێتەوە، یەكێك هەموو هەفتەیەك دەیبردین بۆ بازاڕی خواردەمەنی و چیمان پێویست بوایە دەمانكڕی و ئەوان پارەكەیان بۆ دەدایین، یەكێكی تریان بە كاروباری خوێندنی چوار منداڵەكەی منەوە خەریك بوو، كە هەریەكەیان پاش تاقیكردنەوەیەكی هاكەزاییو بە پێی تەمەنیان لە قۆناخی ڕاست و دروستی خوێندنی خۆیان وەرگیران. قەشەی كەنیسەكەش، كە ناوی هێندری هاریسۆن بوو و بە فازەر هاریسۆن Father Harrison واتە باوكە هاریسۆن بانگ دەكرا و پیاوێكی تەمەن شەست ساڵی بەڕێز و ڕووخۆش بوو. چەند جارێك لە ماڵەوە سەردانی كردین و هەر هەموویان زۆر جەختیان لە سەر ئەوە دەكردەوە كە داب و نەریتی خۆمان بپارێزین و كولتووری ولاتی خۆمان لەبیر نەكەین. گەلێك لەوانە كە پرسیارمان لێدەكردن بە ڕەچەڵەك خەڵكی كوێیە لە وەلامدا دەیوت باپیرە گەورە گەورەم لە ئەڵمانیا، بەریتانیا، فەرەنسا، ئێرلەندا..تاد هاتووەو شانازیشی بەو ڕەگوڕیشە دوورەیەوە دەكرد. ئێمە گەڵێ جار هەندێ دیاردەی كۆمەڵایەتی و ژیاریی ئەو وڵاتەمان پێ سەیر بوو یان پێ نەشاز بوو كاتێ دەرمان دەبڕی بە بزەیەكەوە دەیانوت "ئەمە ئەمەریكایە! This is America". ئەم قسەیەم لە دەیان كەسی ئەو وڵاتەوە گوێ لێدەبوو و زۆر جار بە تەوس و ناڕەزاییەوە دەیانوت، یان لە ڕووی كۆبوونەوەی ئەو هەموو

جیاوازییه کۆمەڵایەتی و ئیتنی و ئاینی و مەزەب و هەزار ڕەنگەوە بوو کە لە هەموو شوێنێکدا هەستت پێدەکرد.

با بێمەوە لای کەنیسە. ئەو هەموو ژن و پیاوەی خۆیان خستبووە خزمەتی ئێمەوە دەیانزانی ئێمە موسڵمانین، هەرچەندە کەس لەو وڵاتەدا لە ئاین و نەتەوەی کەسی تر ناپرسێ و پرسیار کردنیشی بەجێ نیە.

جارێکیان پێیانوتین پێمانخۆشە ڕۆژێکی یەکشەمە، کە ڕۆژی کۆبوونەوە و نوێژی ئەوانە، سەردانێکمان بکەن و بۆ خۆتان تەماشای ڕێورەسمی نوێژ و پاڕانەوەی ئێمە بکەن وەك میوان و ئێمەش بەخۆشحاڵییەوە بانگهێشتەکەمان قوبووڵ کردن. پاش بەینێك من پێموتن ئێمە بە ناوی دوو بنەماڵەکەوە کە ئەم هەموو هاوکاری و دەسگرۆییەتان کردووین پێمان خۆشە لە ڕۆژێکی یەکشەمەدا کە نزیکەی دووسەد کەسیان لە هۆڵێکی گەورەی ئەنجامدانی نوێژ و پاڕانەوەیاندا کۆدەبوونەوە، سوپاسێکتان بکەین. بۆ ئەم مەبەستە نزیکەی پێنج شەش دەقیقەیان دا بە من کە بە ناوی هەردوو بنەماڵەکەوە سوپاس و م[illegible]ەتباریی خۆمانم دەربڕی بۆ ئەو باوەش کردنەوەیە و ئەو خزمەتەی کە کر[illegible]نیاین و هەندێك باسی جینۆسایدی کورد و زوڵم و ستەمی ڕژێمی عێراقم کرد و ئەو گیانی مرۆڤدۆستی و خێرخوازییەی ئەوانم شوبهاندە گیانی عیسای مەسیح و بە ڕاستیش هەروا بوو. بە خوێندنەوەی وتەکە زۆربەیان کەوتنە گریان و فرمێسك ڕشتن.

هەندێ دۆست و برادەرمان لە شار و ویلایەتەکانی تر کە کەنیسە و مەزەبی مەسیحیی تر بووبوون بە سپۆنسۆریان جارجار بە تەلەفۆن سکاڵای ڕەفتاری هەندێك لەو کەسانەیان دەکرد کەوا هەڵسوکەوتی مسیۆنێرییان لەگەڵ نواندوون. برادەرێکم تووشی مەسەلەیەکی وا بووبوو، ڕێکوپەوان پێی وتبوون لە وڵاتی ئێمە ئەوەی بەزۆر یان بە دەمچەورکردن ببێتە بەعسی ئێمە وایدادەنێین کەسێکی ڕەوشت نزم بێت و لە کۆمەڵدا بە خراپ تەماشا دەکرێت و ئەمەی ئێوەش هەمان مەسەلەیە بۆ ئێمە. ڕاستێکەی ئەوەی ئێمە لە ژن و پیاوەکانی کەنیسەکەی شاری ڕۆزوێڵمان بینی لە [illegible]ۆڤدۆستی و ڕەوشتبەرزی بەولاوە هیچیتر نەبوو.

ئەو ژنەی کە سۆراخی ئیش دۆزینەوەی بۆ دەکردین، گەلێجار دەیبردین بۆ نووسینگەکانی کار دۆزینەوە و فێری دەکردین چۆن فۆرم پڕبکەینەوە و مێژووی کارکردن و شارەزایی پێشوومان بخەینەڕوو بە سیستەمێك کە لەو ولاّتە پێی دەوترێ ڕیزیومی resume، واتە کرۆنۆلۆجیای کارکردنت لە شوێنی جۆراوجۆر، ئەمە لە ئەوروپا و ئەوە چەند ساڵێکە لێرە CV یان Corriculum Vitae ی پێدەڵێن. ئێمە بیستبوومان خەڵك لە ئەوروپا هەندێ کاری وەك پاککردنەوەی پیر و پەککەوتە دەکەن و بڕیارمان دابوو ئەگەر لەبرسا مردووین کاری لەو جۆرە نەکەین. ڕۆژێکیان ئازاد بە ژنەکەی کەنیسەی وت هەموو کارێك دەکەم ئەوەیان نەبێت، ئەویش بزەیەك گرتی و وتی جا خۆ من خۆم ئەو کارە دەکەم!

# سەردانێك بۆ مەزاری مارتن لووسەر كینگ

ئەم پیاوە ڕابەرێكی گەورەی ڕەشپێستەكانی ئەمەریكا بوو، لە هەمان كاتیشدا پیاوێكی ئاینی مەسیحییەت بوو، لە ویلایەتە یەكگرتووەكان زۆرێك لەو ڕەشپێستانە بە دڵسۆزییەوە پابەندی مەسیحییەتن، هەشیانە موسڵمان بوون و هاتوچۆی گەرمی مزگەوت دەكەن.

هەموو كەسێك لەو وڵاتە ئاشنای ناوی مارتن لووسەر كینگە Martin Luther King Jr. و لە ناخیدا ڕێزی زۆر بۆ خەباتی ئەو پیاوە دادەنێت. ئەم پیاوە گاندی ئاسا ڕێبەرایەتی بزووتنەوەیەكی ئاشتیانەی دەكرد، بۆ دابینكردنی گەلێ مافی زەوتكراوی ڕەشپێستەكان، كە تا ئاخروئۆخری شەستەكانی سەدەی بیستەمیش بۆیان نەبوو تێكەڵی سپیپێستەكان ببن و پاس و شەمەندەفەری هاتوچۆكردنیان جیابوو، چێشتخانە و قاوەخانەیان جیابوو. زۆر ڕەگەزپەرستانە لێیان دەڕوانین و تەنانەت زۆر بە زەحمەت كاریان دەستدەكەوت، بێبەری بوون لە خوێندن و ئەگەریش بۆیان بڕەخسایە قوتابخانەیان جیابوو و نەدەبوو منداڵیان تێكەڵی منداڵانی سپیپێست بن. ڕەشپێستەكان بە زۆریی لە ویلایەتەكانی باشووری ئەمەریكا دەژیان و بەتایبەتی سەنتەری كۆبوونەوەیان لە ویلایەتەكانی جۆرجیا و ئەلەباما و فلۆریدا و تەنەسی و كارولاینای باشوور و چەند ویلایەتێكی تر بوون. ئەگەرچی بە ڕادەیەكیش لە هەموو ویلایەتەكانی ئەمەریكادا پەرش و بڵاوبوون و بە تایبەتی لە شارە گەورەكاندا بە دوای نان و كار پەیداكردندا وێڵبوون. زۆرێك لەوانە، بە ئێستاشیانەوە، ئاستی دەرامەتیان نزمە و كاری باشیان دەست نەدەكەوت و ئاستی خوێندنیان باش نەبوو و لە خانووی زنج ئاسادا دەژیان.

ڕەشپێست لە ئەمەریكادا مێژوویەكی دوورودرێژی پڕ لە مەینەتی و چەوسانەوەیان هەیە و باوباپیرانیان لە سەدەكانی ڕابوردوودا و پاش دۆزینەوەی ئەمەریكا وەك كۆیلە هێنراونەتە ئەم وڵاتە و لە ژێر باری زەوی كێڵان و كاری قورسدا پسانەوونیان. كاتێ كە ئەوروپاییەكان لە دەست زوڵم و ستەمی كەنیسە هەڵدەهاتن و ڕوویان دەكردە ئەو جیهانە نوێیەی ئەمەریكا، بە دوای نان و ژیاندا، دیاردەیەكی هێجگار قێزەون لە مێژووی مرۆڤایەتیدا هاتە ئاراوە، ئەویش بازرگانی كردنی كۆیلە بوو. وڵاتە كۆلۆنیالیستەكانی ئەوروپا، بە تایبەتی بەریتانیا، فەرەنسا، پورتوگاڵ، ئیسپانیا، ئیتاڵیا زۆربەی خاكی

ئەفریقا و ئاسیا و ئەمەریكای لاتینیان بە دەستەوە بوو و چی سەروەت و سامانیان هەیە بە تالآنیان دەبرد و خەڵكەكەیان بە برسی و ڕەش و ڕووتی دەهێشتەوە. كاتێكیش سپیپێستی ئەوروپایی بە لێشاو ڕوویانكردە خاكی بە فەڕو پیتی تازە دۆزراوەی ئەمەریكا و وردە وردە شاریان دروستكرد و شارستانیەتیان بنیاتنا و ئەوانەی پێیاندەوترێ "هندییە سوورەكان" دەركران و قڕكران. ئەوان لەم وڵاتە پان و پۆڕەدان زۆریان پێویست بە هێزی كار بوو، لەبەر ئەوەی كە ئەو وڵاتانەی ناوم بردن ئەفریقای ڕەش و ڕووتیان لە بن دەستدابوو، كەوتنە پاكۆدان و ڕاوكردنی خەڵكە هەژارەكەی و پاپۆڕ لە دوای پاپۆڕیان لێ پڕدەكردن و ڕەوانەی ئەمەریكایان دەكرد و لەوێ وەك كۆیلە بە هەرزان دەیانفرۆشتن و لە ژێر كاری تاقەت پڕووكێنی قورسدا گەلێكیان لەناوچوون. پاشان كە وردەوردە ڕەوتی سەرمایەداری چەسپاو ئابووری بەهێز بوو و ویلایەتەكانی ئەمەریكا خۆیان لە ژێر دەستی بەریتانیا ڕزگاریان بوو و بنەماكانی حوكمی دیموكراتی لە سەر شێوازی ئەوروپا چەسپا و شەڕی ناوخۆی باشوور و باكووری ویلایەتە یەكگرتووەكان (١٨٦١ – ١٨٦٥) بە قازانجی باكوور كۆتایی هات و سیستەمی كۆیلەیی هەڵوەشێنرایەوە، ڕەشپێستەكان ئازاد بوون، بەڵام فەرهەنگی دزێوی جیاوازی لە سەر بنەمای ڕەگەز و ڕەنگ هەر مایەوە و كۆیلەكانی جاران بە هەزار و یەك شێوە دەچەوسێنرانەوە.

ئەم بارودۆخە بوو كە وای لە مارتن لووسەر كینگ كرد بزووتنەوەیەكی یاخیبوونی مەدەنی دروست بكات، بە مەبەستی نەهێشتنی جیاوازیی ڕەنگ و ڕەگەز و خەڵكێكی زۆری ڕەشپێست شوێنی كەوتن و لە ویلایەتەكانی تەنەسی و جۆرجیا و ئەلەباما خۆپیشاندانی گەورە گەورەی ڕەشپێستەكان سازدەكرا وگەلێ جاریش سپیپێستە دیموكراتخواز و مرۆڤدۆستەكانیش بەشدارییان دەكردن. بزووتنەوەكە لە سەرەتای ساڵانی شەستەوە دەستی پێكرد و سەرانسەری ئەمەریكا و بگرە بەشێكی زۆری جیهانیشی سەرقاڵ كردبوو.. حكومەتی ئەمەریكا چەند ویستی بە پارەی زۆر و بە پلەوپایە ڕابەری بزووتنەوەكە بە لای خۆیدا ڕابكێشێت، بەڵام نەیتوانی و "مارتن لووسەر كینگ" بەردەوام بوو لە سەر بانگەشەی مافە مەدەنیەكانی ڕەشپێست و وتارە ئاگرینەكانی لە سەرانسەری دنیادا دەنگی دەدایەوە و خەڵكی لە دەوری بزووتنەوەكە كۆدەكردەوە و تا دەهات خۆپیشاندان زیاتر دەبوو.

لەولاشەوە سپیپێستە توندڕەوەكان باند و بزووتنەوەی تایبەتی خۆیان دروستكردبوو و بە ڕاست و بە چەپدا گورزی ڕەگەزپەرستانەیان دەسرەواندە ڕەشەكان و دەیانكوشتن و

دەیانسووتاندن و پەتپەتێنی دنیایان پێدەکردن. لەم بوارەشدا باندەکانی کوکلوکس کلان Ku Klux Klan (کە لە دوادوایی شەڕی ناوخۆی ئەمەریکاوە دروستبووبوو لە دژی ڕەش و جوولەکە و کاسۆلیك و کۆچبەر و دروشمیان خاچی سووتاو بوو) زۆر پەرگرانە دەستی لە ڕەش نەدەپارست و بارودۆخی ویلایەتەکانی باشوور بە تەواوی شپرزە و شێوابوو، تا لە ڕۆژێکی پایزی ساڵی ١٩٦٨دا زەفەریان بەو پیاوە کۆڵنەدەرە برد و لە شاری مەمفیس لە ویلایەتی تەنەسی کوشتیان، بەڵام لەم کاتەدا گەلێك لە ئامانجی خەبات و تێکۆشانەکەی سەپاندبوو بە سەر حکومەتی ئەمەریکادا و گەلێك یاسا لە بەرژەوەندی ڕەشپێستەکان تەشریع کرابوو، لەوەدابوو تارادەیەکی باش بەری ڕەنجی ئەو و هەزاران بەشخوراوی ڕەشپێست بێتەدی کە بریتیبوو لەو خەونەی گەلێ جار لە وتارەکانیدا دووپات دەبوونەوە و بوون بە مۆرکی ئەو پیاوە کە بە "من خەونێکم هەیە I have a Dream" دەستپێدەکات و دەڵێت: "من خەونێکم هەیە کەوا ڕۆژێك دێت لە سەر گردە سوورەکانی جۆرجیا، ڕۆڵەی کۆیلەکانی جاران لە گەڵ ڕۆڵەی خاوەن کۆیلەکانی جاراندا پێکەوە لە سەر مێزی برایەتی دادەنیشن. من خەونێکم هەیە کەوا ڕۆژێك دێت چوار منداڵە بچکۆلەکەم لە وڵاتێکدا دەژین بە پێی ڕەنگی پێستیان تەماشا ناکرێن و مامەڵەیان لە گەڵ ناکرێت، بەڵکو بە پێی ئاستی سیفەت و کەسێتییان هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکرێت. من ئەمڕۆ ئەو خەونەم هەیە!".

بەڵێ باندەکانی سپیپێست مارتن لووسەر کینگیان کوشت و لە شاری مەمفیسەوە سەدان هەزار کەس شوێن تەرمەکەی کەوتن بۆ ویلایەتی جۆرجیا و لە ناوجەرگەی گەورە شاری ئەتلەنتادا، کە زێدی خۆی بوو، بە خاکیان سپارد.

ئەمڕۆ گۆڕەکەی مارتن لووسەر کینگ مەزارێکی گەورەیە لە شاری ئەتلەنتادا و هەرکەسێك هەستێکی مرۆڤدۆستی و نیشتمانی و نەتەوەیی تێدابێت و ڕێی بکەوێتە ویلایەتی جۆرجیا و شاری ئەتلەنتا دەبێ سەر لەم مەزارە بدات. گۆڕەکە لە سەر شەقامێکە ناوی مارتن لووسەر کینگی هەلگرتووە، بە مەرمەڕی سپی هەڵبەستراوە و لە ناوەڕاستی حەوزێکی ئاودایە. لە نزیکیەوە سەنتەر و مۆزەخانەی دژە توندوتیژی Antiviolence هەیە کە تەواوی نووسین و یادگار و ڕۆژانی خەباتی ئەو پیاوەی پاراستووە و ژنەکەی و کوڕەکەی بەڕێوەی دەبەن. مەزارەکە و بینای سەنتەری دژە توندوتیژی و مۆزەخانەکە، بە شێوازێکی کاریگەر و گونجاو لەگەڵ خەباتی ئەو پیاوەدا دروستکراون.

من پاش ئەوەی لە شارۆچکەی ڕۆزوێل Roswell ی نزیك ئەتلەنتا جێگیر بووم ڕووم لە دۆستێکی ئەمەریکی نا، کە پیاوێکی تەمەن ٦٥ ساڵ بوو و ناوی "بیل کایم" بوو، سپی

پێست بوو و سەر بە کەنیسەی سانت دێڤیدی مەزەبی ئێپیسکۆپاڵ Episcopal ی مەسیحی بوو، کە زۆر مرۆڤدۆست و بە خزمەت بوو، ڕووم لێنا بمبات بۆ سەر ئەو مەزارە وەك شارەزا و چاوساغ. خوا هەڵناگرێ بێدڵیی نەکردم و بە ئۆتۆمبیلەکەی خۆی بردمی و گەڵ وێنەم لە سەر مەزارەکە گرت، بەڵام ئەوەی زۆر سەرنجی ڕاکێشام و سەیر بوو لەلام کاتێ بە "بیلّم" وت با پێکەوە وێنەیەك لە سەر مەزارەکە بگرین، ئەو زۆر بە ئەدەبەوە داواکەمی ڕەتکردەوە و هیچ هۆیەکی پێ نەوتم. دوای تێکەڵبوونم بە ژیانی ئەو وڵاتە، وەڵامەکەم هاتە دەست و زانیم هێشتا لەگەڵ یەکتر پاك نەبوونەتەوە و سەرباری گەڵ گۆڕانی بنەڕەتی لەو کۆمەڵەدا هێشتا هەر نەریتی لە ژێرەوە حەز بە یەکتر نەکردن کاری خۆی دەکات.

با بیرم نەچێت، نەریتێك هەیە کە دەچیتە سەر مەزاری ئەو پیاوە تاقە سەنتێك فرێدەدەیتە ناو گۆماوی دەوری گۆڕەکە و ئاواتێك دەخوازیت. ئێمە لەمەودوا کە خۆمان شارەزا بووین و لەگەڵ ماڵ و منداڵدا سەردانی ئەو مەزارەمان دەکرد، هەریەکەمان سەنتێکمان هەڵدەدا ئاوەکەوە و دۆعای ئەوەمان دەکرد زوو بگەڕێینەوە بۆ وڵاتی خۆمان، چونکە غوربەتێکی هێجگار سەخت لە ناخەوە کاری تێکردبووین.

مارتن لووسەر کینگ لە ١٥ ی کانوونی دووەمی ١٩٢٩ لە شاری ئەتڵەنتا لەدایکبووە و باوکی و باپیریشی قەشەی کەنیسەی باپتیست بوون لەو شارەدا. لە تەمەنی ١٥ ساڵیدا خوێندنی ئامادەیی تەواوکردووە و ساڵی ١٩٤٨ یش بەکەلۆریۆسی ئادابی لە کۆلێجی مۆرهاوس وەرگرتووە، کە ئینستیتۆیەکی تایبەتی ڕەشپێستەکان بووە لە ئەتڵەنتادا و هەر لەو شوێنەش باوکی و باپیری خوێندنیان تەواوکردووە. ساڵی ١٩٥١ خوێندنی لاهووتی لە پەنسلڤانیا تەواوکردووە و ساڵی ١٩٥٣ بڕوانامەی دوکتۆرای بەدەستهێناوە. ساڵی ١٩٥٥ خاتوو کۆرێتا سکۆتی خاستووە و دوو کوڕ و دوو کچی لێ هەبوو.

ساڵی ١٩٥٤ بووە بە قەشەی کەنیسەی باپتیست لە شاری مۆنتگۆمەری لە ویلایەتی ئەلەباما. کینگ هەمیشە بە توندی داکۆکیی لە مافە مەدەنییەکانی هاوڕەگەزەکانی دەکرد و لەم ماوەیەدا ئەندامی کۆمیتەی ڕاپەڕاندنی ڕابیتەی نیشتمانیی پێشکەوتنی خەڵکی ڕەشەپێست بوو، کە ڕێکخراوێکی ڕابەر بوو لە وڵاتدا. لە دیسەمبەری ١٩٥٥دا بوو یەکەم خۆپیشاندانی ناتوندوتیژی ڕەشپێستەکان لە مێژووی نوێی ئەمەریکادا و وەك نارەزاییەك ماوەی ٣٨٢ ڕۆژ سواری ئەو پاسانە نەبوون کە بە تایبەتی بۆ ڕەشپێستەکان تەرخانکرابوون. لە ٢ ی دیسەمبەری ١٩٥٦دا دادگای باڵای ئەمەریکا بڕیارێکی دەرکرد کەوا

ڕەش و سپی دەتوانن پێکەوە لە یەك پاسدا سەربکەون. لەم ماوەی بایکۆت کردنەدا کینگ گیرا و ماڵەکەی بەر نارنجۆك درا و دەسدرێژیی شەخسیی کرایە سەر، بەڵام لە هەمان کاتدا وەك ڕابەرێکی ڕەشپێستەکان دەرکەوت. ساڵی ١٩٥٧ بە سەرۆکی کۆنگرەی ڕابەرە مەسیحییەکانی باشوور هەڵبژێردرا کە دواتر بزووتنەوەی مافە مەدەنییەکانی لێکەوتەوە. کینگ ئایدیای ئەم بزووتنەوەیەی لە مەسیحییەت و مهاتما گاندییەوە وەرگرت و لە ماوەی یانزە ساڵی نێوان ١٩٥٧ - ١٩٦٨ دا نزیکەی شەش ملیۆن میل ڕێگاوبانی بڕی بە گەشتکردن بۆ شار و شوێنی جۆراوجۆر و زیاد لە دوو هەزار و پێنجسەد وتاری داوە و لەو شوێنانەدا دەردەکەوت کەوا کاری ناعەدالەتی و دەربڕینی ناڕەزایی تێدا بەرپادەکرا.

لەم ماوەیەدا پێنج کتێبی دانا و ژمارەیەك هێجگار زۆر بابەت و وتاری نووسی و ڕابەرایەتیی پرۆتێستە جەماوەرییەکانی دەکرد لە شاری بیرمینگهامی ئەلەباما و سەرنج و سۆزی تەواوی دنیای بە لای خۆیدا ڕاکێشابوو. بابەتی "نامەیەك لە زیندانی بیرمینگهامەوە" ی کینگ ئیلهامبەخش بوو بۆ شۆڕشی نیگرۆکان، هەروەها کاری بۆ ئەوە دەکرد کە ڕەشپێستەکان وەك دەنگدەر تۆمار بکرێن و ڕابەرێتیی ئەو ڕێڕەوەی کرد بۆ واشنتۆن کە دوو سەد و پەنجا هەزار کەس بەشدارییان تێدا کرد. ئەم پیاوە لەو تەمەنە کورتەی ژیان و خەباتیدا کەوا نەگەیشتە چل ساڵ، بیست و چوار جار گیراوە و چوار جاریش دەسدرێژیی کراوەتە سەر و بوو بە ڕابەری ڕەمزیی ڕەشپێستە ئەمەریکییەکان و هەموو کاتیش کەسایەتییەکی جیهانی بووە.

مارتن لووسەر کینگ لە تەمەنی ٣٥ ساڵیدا گەنجترین پیاو بووە کە خەڵاتی ئاشتیی نۆبڵی دراوەتێ و پارەی خەڵاتەکەی، کە نزیکەی ٥٤ هەزار دۆلار بوو، بەخشییە بزووتنەوەی مافە مەدەنییەکان. لە ئێوارەی ٤ ی نیسانی ١٩٦٨ دا لە شاری مەمفیسی ویلایەتی تەنەسی و لە کاتی ڕابەریکردنی خۆپیشاندانێکی ناڕەزاییدا لەو شارە تیرۆرکرا.

ڕەشپێستەکان (یان نیگرۆکان) لەوێ زۆریان پێناخۆشە بە ڕەش black ناویان بێنیت، بەڵکو زیاتر وایان پێباشە بە ئەمەریکیە ـ ئەفریقیەکان American African ناوبهێنرێن. گەلێکیان خەڵکی باش و بێوەی و ڕەوشت بەرزن و دۆستایەتییان خۆشە و من بەش بە حاڵی خۆم تا ئێستا یادگاریی کەسانی وەك "دێریك و میشێلێ و لیزا و سینتیا"م پاراستووە، بەڵام پیاو ڕاست بڵێ زۆرێکی زۆریان لە ئەنجامی نەریتی مێژوویی چەوساندنەوە و بێبەشبوون لە گەلێ مافی ژیان زۆر توندوتیژ و دڕ و گەوج و ناحاڵین. هەر ئەوەندەی تێکچوون لەگەڵت دۆ و دۆشاو تێکەڵ دەکەن و بە تەواوی وەڕست دەکەن. لە هەندێ گەڕەکی ئەتڵەنتا بووبوونە دوژمنی ئاساییە چاوتەسکەکانی وەك ڤێتنامی، چینی،

کەمبۆدی، چونکە ئەمانە ئیشکەر بوون و هەموو خاوەن کۆگا و بازاڕ و کارگەیەك دەیخواست کاریان بداتێ. لە کاتێکدا ڕەشەکان بە ئاسانی ئیشیان دەست نەدەکەوت، لە بەر ڕەفتاری توند و فڕوفێڵیان، گەلێ جاریش لە نێوانیاندا (واتە ئاسیایی و ڕەشەکان) شەڕە گەڕەك دروست دەبوو.

ڕەشپێست ئێستا لە ئەمەریکادا ژمارەیان زیاد لە ٣٠ ملیۆن کەسە و لە هەموو شوێنێ دڕ و بێحەیا و چەقاوەسوون (ئەڵبەتە وەك وتم خەڵکی باشیشیان زۆر تێدایە) و ئێستا سپیپێست زۆریان سڵ لێدەکەنەوە. ئەگەرچی هەموو کەس لەو وڵاتە پابەندی قانوونە، بەڵام ئەمان هەندێ جار لە داخی دڵی خۆیان سەرپێچی لێدەکەن و چەندین جار دیومە منداڵی خۆیان داوەتە بەر زللە و کەسیش نەیوێراوە پێیان بڵێ لەل.

ئەو ڕەشپێستانەی تازە لە وڵاتانی ئەفریقیاوە دەهاتن و هێشتا کورد واتەنی چاویان نەکرابووەوە، زۆر هێمن بوون و هەلسوکەوت لە گەڵیان خۆش بوو. ئەمرۆ ڕێژەی ڕەشپێست لە ئەمەریکادا، زیادبوونێکی بەرچاو بەخۆوە دەبینێ و زۆربەی کچەکانیان شوو دەکەن بە پیاوێکی خەڵکی ئەفریقا و بەمجۆرە هەلی بۆ دەڕەخسێنن بە شێوەیەکی یاسایی کۆچ بکات بۆ ئەم وڵاتە. هەموو کەس لێرە شانازی بە ڕەگ و ڕیشەی خۆیەوە دەکات، بە ئەمەریکییە ئەفریقییەکانیشەوە. لێی دەپرسی لە بنەڕەتدا خەڵکی کوێی، پێت دەڵێ باپیرە گەورە گەورەم لە بریتانیا، ئەڵمانیا، فەرەنسا و نازانم کوێوە هاتوو. ئەمانیش لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا دەڵێن باپیرە گەورە گەورەمان بە کۆیلەیی لە کۆنگۆ، سەنیگال.. تاد هاتووە و هەموو کەس هەوڵدەدات ئەو فەرهەنگە دێرینەی بپارێزێت و هەر ئەمەریکییەکیش ببێتە دۆستت پێت دەڵێ ئاگات لێبێت کولتوور و فەرهەنگی خۆت بپارێزە و لە دەستی نەدەیت.

جارێکیان ژن و مێردێکی ڕەشپێستی خەڵکی کۆلۆرادۆ بوون بە ئاشنام، ئەمانە منداڵێکی کچی سێ چوارساڵیان هەبوو ناویان نابوو "سەکیرە مەئاد". ناوەکە سەرنجی ڕاکێشام و پێموتن مانای چیە؟ وتیان نازانین ڕەنگە عەرەبی بێت، چونکە باپیرە گەورە گەورەی ئێمە پێش سەد ساڵێك لە ناوچەی نووبەی نێوان سوودان و میسرەوە هاتووە و ڕەچەڵەکی ئێمە دەچێتەوە سەر خێڵێکی ئەفریقی، کەوا کولتووری عەرەب و ئیسلام زۆر کاری تێکردووە و ئێمەش تا بتوانین نامانەوێت پاشماوەی ئەو کولتوورە لەدەست بدەین. کاتێ پێموتن ئەم ناوەی ئێوە لە "الصغیرة معاد"ەوە هاتووە و ماناکەیم بۆیان لێکدایەوە زۆریان پێخۆش بوو.

# سەگی براوە.. جەنەراڵی دۆڕاو

خانمی هێژا ڤێرای سەعید پوور، بە تەمەنی سەروو حەفتا ساڵیەوە، چالاکانە و بە گیانێکی گەنجانەوە دەستی داوەتە کارێکی گەورەی فەرهەنگی و ڕۆشنبیری بۆ کورد. ئەم خانمە ئەمەریکییە نووسەر و ڕۆشنبیرە، وەك وەفایەك بۆ یادی مێردە کوردە کۆچکردووەکەی، لە ساڵی ١٩٨٦ەوە لە شاری نیویۆرکی ئەمەریکا دەزگایەکی دامەزراندووە بە ناوی کتێبخانەی کوردی Kurdish Library کەوا مۆزەخانەیەکی کوردەواریش لەخۆ دەگرێت. ئەرکی ئەم دەزگایە ناساندنی فەرهەنگ و کولتووری کوردە بە زانستگە و نێوەندە ڕۆشنبیرییەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و زانکۆی هارڤاردی بەناوبانگی ئەمەریکی هاوکارێکی باشێتی. دەزگاکە گۆڤارێکی وەرزانەی توێژینەوە دەردەکات بە ناوی "توێژینەوەی کوردی Kurdish Studies" بە زمانی ئینگلیزی و بە سەرپەرشتیی خاتوو ڤێرا و ئەندامانی دەستەی نووسەرانیشی ئەم بەڕێزانەن: عەزیز باوەڕمەند، ڕێبیکا بیۆدین، پۆڵ بلۆم، لوقمان محوّ، کێرڵ نێستۆر، فەرهاد شاکەلی. ئەم گۆڤارە گەلێ توێژینەوەی کوردیی لەخۆگرتووە بە زمانی ئینگلیزی و تا ئێستاش بەردەوامە. هەروەها وەرزانەش بڵاوکراوەیەکی ٢٠ – ٣٠ لاپەڕەیی دەردەکات لە سەر بارودۆخی کوردستان بە ناوی "ژیانی کوردیی Kurdish Life".

کە ساڵی ١٩٩٦ چوومە ئەو وڵاتە، کاك فەرهاد شاکەلی، باسی منی بۆ کردبوو و تەلەفۆن و ناونیشانیشمی دابوویە. کاری ڕاست بێت زوو پەیوەندیی پێوە کردم و زۆری ڕێز لێنام، ماشەڵای لێبێت کە تەلەفۆنی بۆ دەکردم لە سەعات زیاتری پێدەچوو و زۆر خەمخۆری هەموو بوارێکی ژیانی کورد بوو و بەردەوام خەمی بۆ هەڵدەڕشتم و زۆر نیگەرانی خۆخۆری و شەڕی ناوخۆکەمان بوو. ماڵی ئاوا بێت ئەویش زۆر بە توندی دەنگی خۆی خستە پاڵ کۆششی داواکاریمان لە ڕێکخراوی هیومان ڕایتس ووچ – بەشی میدڵ ئیست بۆ ئەوەی مۆڵەتی چاپکردنی وەرگێڕانە کوردییەکەی کتێبی "جینۆساید لە عێراقدا و پەلاماری ئەنفال بۆ سەر کورد"مان بداتێ، کە ئەو دەمە هەلێکی چاپکردنی بۆ هەڵکەوتبوو لە ئەورووپا.

کاتێ کە باسی ئەوەم کرد کەوا دەستنووسێکی کۆکردنەوەی هۆنراوە و چیرۆکی فۆلکلۆریی کوردەواریم لایە و بەری ڕەنجی گەڕان و کۆکردنەوەی نزیکەی ١٥ ساڵمە زۆری پێخۆشبوو بۆی بنێرم، بۆ ئەوەی لە ڕێگای شارەزا و پسپۆڕەکانی هاوکاریەوە وەریگێڕێتە سەر زمانی ئینگلیزی و بڵاوی بکاتەوە، هەر واشی کرد و بەشی چیرۆکە فۆلکلۆریەکانی لە

لایەن پرۆفیسۆر ویلەر تاکستۆن Wheeler Thackston ی بەرپرسی دیراساتی ئێران و لورستان لە زانکۆی هارڤارد کرا بە ئینگلیزی و بەرگێکی تەواوی گۆڤاری "لێکۆڵینەوەی کوردی Kurdish Studies" ی بۆ تەرخان کرد لەگەڵ پێشەکییەکی تێروتەسەلی پرۆفیسۆر تاکستۆندا و لە پایزی ساڵی ١٩٩٩دا لە نیویۆرك بە چاپ گەیشت. بەشی هۆنراوەکانیشی تا ئێستا لەو دەزگایە چاوەڕێی وەرگێڕێکی کارامەی چەشنی دوکتۆر تاکستۆنە بیکاتە ئینگلیزی و بلاوی بکەنەوە. شایانی باسە دەزگاکەی ڤێرا خانم بە پیتاك و یارمەتیی شارەوانیی نیویۆرك بەڕێوەدەچێت. تەنانەت کە من دەسنووسەکەم بۆ ناردن داوای لێکردم بە خەتی خۆم بۆی بنووسم کەوا پێشکەشم کردوون و داوای هیچ خەلات و بەراتێك ناکەم. وەی بە سەرچاو منیش بۆم نووسین "وا ئەم دەسنووسەم پێشکەش کردن و ڕێگەتان دەدەم وەریبگێڕنە سەر زمانی ئینگلیزی و هەر زمانێکی تری دنیا و بەڵێن بێ لە پارەی کارکردنی خۆیشمی بخەمە سەر". ڤێرا خانم دەقی ئەم پێشکەشکردنەی لە کتێبەکەدا بلاوکردووەتەوە، ئەمە دنیایە نەوەك من بڵێم وامنەگوتووە!

بێینەوە سەر ئەسڵی مەبەست. بەهاری ساڵی ١٩٩٨ من خۆم ئامادە دەکرد لە هاوینەکەیدا خواحافیزیی یەکجارەکی لەو ولاتە بکەم و ڕۆژێکیان سندووقی پۆستەم کردەوە تەماشا دەکەم ڤێرا کارتێکی بۆ ناردووم وێنەی سەگێکی ناوقەد باریکی تووکنی لە سەرە و لە ژێریەوە نووسراوە تانجیی کوردی و ناواخنەکەشی ئەمەی خوارەوەی تێدایە:

"بڕوا دەکەیت یان نە، لە ساڵی ١٨٦٣دا تانجییەکی کوردی خەلاتی یەکەمی بردووەتەوە لە پێشانگای نێودەوڵەتیی سەگدا لە پاریس. وێنەی تانجییەکە بە چاپی بەردین یان لیتۆگراف lithograph کێشراوە لەگەڵ سەگە براوەکانی تردا و لە ڕۆژنامەی ئەو دەمەی (لەندەن ئیللەسترەیتد نیوزدا London Illustrated News) دەرچووە. تانجییەکە یەکێك بووە لە شەش جۆری سەگ کەوا لە بەر قەشەنگترین شێوە و ڕوخسار و خاسیەت هەڵسەنگێنراوە. بیری لێبکەرەوە، پێش زیاد لە سەدەیەك سەگێك خەلاتی براوەیی و ڕێزلێنان بە چنگ دێنێت بۆ ئەو میللەتەی بایەخی بەخێوکردن و چاککردنی جۆری ڕەچاوکردووە. هاوکاری کردنت لەڕووی داراییەوە یارمەتیمان دەدات پەردە لە سەر ئەو ساتانەی مێژووی کورد هەڵدەینەوە کە تاریکی داپۆشیون. هیواداریـن بۆ ساڵی ئاینده بەردەوام بیت لە پشتگیریماندا."

لە گەڵ ڕێزی

کتێبخانە و مۆزەخانەی کوردی

ڕاستێکەی منیش بە چەردەیەك پارە هاوکارییەکی بچووکم کردن و لای خۆشمەوە وتم هەر لە سەگمان کەم بوو! پێموایە پشتگیریکردنی ئەو دەزگایە و ئەو پیرەژنە ڕۆح گەنجە، لەو ولاتە جەنجاڵ و پڕ سەیر و سەمەرەیەدا، کارێکی پێویست بێت.

پێش ئەوەی بە ماڵ و منداڵەوە بگەڕێمەوە بۆ ولات، لەگەڵ ماڵی شیرین خان و کاك هوشیاری دۆستماندا، کە لە ناوچەی جۆنسبۆرۆی باشووری ئەتلەنتا جێگیر بووبوون، چووینە سەیرانگایەکی جوان و قەشەنگ و مێژوویی نزیك ئەو شارە. من لێرەدا لایەنە مێژووییەکەی ئەو سەیرانگایە باسدەکەم، دەنا کەسێك لەو خاریجستانە دەچێتە سەیرانگا یان ناچێت، مەسەلەیەك نیە بۆ خەڵکی بگێڕێتەوە. بەڵکو دەمەوێ لەوە بدوێم کە چۆن ڕووداوێکی مێژووی ئەو ولاتە تا ئێستا مامەڵەیەکی زیندووی لەگەڵ دەکرێت و هەموو کەس ئەوەندە ئاشنایەتی وا دەزانێت دوێنێ ڕوویداوە، کەچی زیاد لە ١٤٠ ساڵی بەسەردا تێدەپەڕیوە. ساڵانی ١٨٦١ - ١٨٦٥، ساڵانی شەڕی ناوخۆی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکایە و ئەوانیش ئەو بەزمەیان بووە، خۆ هەر ئێمە نین و بۆ کەس و لایەنی پاساو حازر ئەمە پاکانە و پاساوێکی باشە! ئەو ساڵانە کە ئەمەریکا لە سیانزە ویلایەت پێکدەهات، خەڵکی ویلایەتەکانی باکوور و باشوور نیشتبوونە سکی یەك. شەڕەکەش هەر لە نێوان سپی پێستەکان خۆیاندا بوو، ئەگەرچی خەڵکی ڕەشپێست و ڕەنگاوڕەنگیشیان بەجۆرێك لە جۆرەکان تێوەگلاندبوو. هۆکاری بەرپابوونی ئەو جەنگە بە دووروردرێژی لە مێژووی ئەو ولاتەدا باسدەکرێت و دەخوێنرێت و یەك لەوانە مەسەلەی ئازادکردنی کۆیلە ڕەشپێستەکان بووە، کەوا حکومەتی فیدراڵیی لە باکوور ویستوویەتی بیکات و دەسەڵاتدارە خاوەن زەوییەکانی باشووریش ملیان پێنەداوە و بەرهەڵستیی بڕیار و فەرمانەکانی حکومەتی باکووریان کردووە و بۆ خۆیان حکومەت و دامودەزگایان جیاکردووەتەوە.

لەو شەڕە پێنج ساڵییەدا خوێنێکی زۆر ڕژاوە وماڵوێرانییەکی زۆر دروستبووە و بە دەستووری نەریتی جەنگکردنی جاران لەشکری هەردوولا ڕیز ڕیز بەرانبەریان لە یەك گرتووە و کەوکوژی تەقەیان لە یەکتر کردووە و ئەڵبەتە بەچەکی ئەو سەردەمە، کە ئەویش هەر تفەنگی بابەتی یەکتیر و پێنجتیر و یانزەتیری لای خۆمانیان هەبووە و بێگومان تۆپیش لە دێرزەمانەوە هەبووە. لەو جەنگەدا ڕیز ڕیز یەکیان قڕکردووە و ئەنجام لایەکیان بەزیون و ئەویتر چنگ لەسەرشان کەوتووەتە کوڵی و بێجگە لە تفەنگ بە کێرد و خەنجەریش یەکتریان داپاچیوە. ئێستاش لە ناوەڕاستی شاری ئەتلەنتادا گۆڕەپانێکی گەورە هەیە کە شەرگەی ئەو دوو بەرەیە بووە و شارەوانیی هەموو یەك شەممەیەك گوڵی تەڕوبڕ و ڕەنگاوڕەنگ لە شوێنی پێکران و کوشتنی ناودارانی ئەو شەڕەدا دادەنێت و مەیدانی شەڕەکە بە گوڵ دادەپۆشرێت و هیچ کاتێ ئەو نەریتە پشتگوێ

ناخەن. ئەنجامی شەڕەکە وا کەوتەوە کە لەشکری باکوور سەرکەوتن بەدەستبێنێ و لە هەر چوارلاوە هێرش بکەنە سەر شاری ئەتڵەنتا، کە مەڵبەندێکی سەرەکی حکومەتو لەشکری باشوور بوو بە سەرکردایەتیی جەنەراڵ ڕۆبەرت لی Robert Lee (١٨٠٧ – ١٨٧٠). شەڕەکە کوشتارێکی گەورەی لێکەوتووەتەوە و دوا نووچدان و بەزینی جەنەراڵ لی و لەشکرەکەی لە ڕۆژهەڵاتی ئەو شارەدا بووە، لە ساڵی ١٨٦٥دا، لە شوێنێکدا کە پێی دەوترێ ستۆن ماونتەین Stone Mountain، واتە شاخەبەردین. جەنەراڵ لە دوای بەزینی لەشکرەکەی خۆیداوەتە دەست هێزەکانی باکوور، بەڵام لەجیاتی کوشتنی دەسبەجێ فەرمانی بۆ دەرچووە هەر بە پلەی جەنەراڵی لە لەشکری ئەمەریکادا بمێنێتەوە و لەم شوێنەدا پاشماوەی بەزیوی لەشکری باشوور تێکەڵ بە هێزەکانی ئەمەریکا بوونەتەوە و شەڕ تەواو بووە. ئەم شوێنە تاقە یەك بەردی زلە بە قەد نیوەی شاخی گۆیژە دەبێت و ئێستا پەیکەری جەنەراڵ لی و دوو جەنەراڵی هاوەڵی، کە لەو شەڕەدا دۆڕان، لە سەر هەڵکۆڵراوە و هەموو خەڵکی ئەمەریکا و بەتایبەتی باشوورییەکان زۆر بە ڕێزەوە تێیدەڕوانن و بە ڕەمزی نیشتیمانی خۆیانی دەزانن و شوێنەکەش هەر لە بەر خاتری ئەو کراوەتە سەیرانگایەکی زۆر گەورە و یەکێکە لە شوێنە گەشتوگوزارییە ناودارەکانی ئەو وڵاتە کە هەموو کەس حەزدەکات ڕووی تێبکات و ڕووبەری ٣٢٠٠ ئەیکەر زەویی داگیر کردووە، کە هەر ئەیکەرێك چوار هەزار مەتری چوارگۆشەیە.

هێڵێکی شەمەندەفەر بە دەوری شاخە بەردەکەدایە کە نزیکەی ڕووبەرێکی وەك شاری سلێمانی داگیرکردووە. دەریاچەیەکی گەورەش لایەکی دامێنی شاخەکەی گرتووە و چواردەوری دارستان و تەختایی و سەوزاییە. لە سەیرانگاکەدا کۆمەڵێك ساختمان و هۆڵ هەن، یەکێکیان پانورامای شەڕەکەی ئەتڵەنتا نمایشدەکات و ئۆدیتۆریۆم یان هۆڵێکی سینەماش لەولاوە هەموو نیوسەعات جارێك فیلمێکی جەنگی ناوخۆ و شەڕە بەناوبانگەکەی ئەتڵەنتا نمایش دەکات. لە لایەکی ترەوە بازارێك کەرەستەی ستۆن ماونتەینو پەیکەرەکانی جەنەراڵ لی و هاوەڵەکانی لە سەر شمەك و کاڵای جۆراوجۆر دەفرۆشێت هەر لە کووپ و ژێرپیاڵە و شووشەواتەوە بیگرە تا چنین و کاری دەست و جلوبەرگ و هەزار شتی تر. پەیکەرێکی گەورەی جەنەراڵ لی لە ناو هۆڵی پانوراماکەدا بە سەر ئەسپەکەیەوە دروستکراوە.

لە باخچەکانی دەرەوەی هۆڵ و بیناکاندا خەڵك بۆ خۆی کۆمەڵ کۆمەڵ دانیشتووە و لە چەندین دووربینی گەورەوە تەماشای ڕیلیفی جەنراڵ لی و هاوەڵەکانی دەکەن کە لە شوێنێکی بەرچاوی شاخە بەردەکەدا هەڵکۆڵراوە و تەلەفریکیش بەردەوام خەڵك دەگوێزێتەوە بۆ سەر شاخ بە ڕاسەری نەخشی هەڵکۆڵراوی جەنەراڵدا.

# ئەمـــەریکـــا و ململانێی کارپەیداکردن

کاتێ لە گوام هەندێك موحازەراتیـان داینـێ لـە سـەر چۆنێتـی کاردۆزینـەوە لـە ئەمـەریکادا و کورتەکـەی ئـەوەبوو تاچـەند زیـرەك و بەهەڵپـەی بـۆ ئـەوەی بـە کرێیـەکی بـاش کـارێك بدۆزیتــەوە و شـێوەی دانوسـتان لەگـەڵ خـاوەن کـاردا و نـەریت و ئـادابی ئـەو دانوسـتانە، واتـە ئەگـەر کـارێکی باشـت دۆزییـەوە یەکسـەر ناڵێی مانگی یان هەفتەی یان سەعاتی چەندم دەدەنێ بۆ ئـەوەی بچمـە سـەر ئـەو کـارە، بـەڵکو مەسـەلەکە دەیـان موجامــەلات و دیپلۆماسـیەتو ڕاوە ڕێـوی لـەخۆ دەگرێت. ئەڵبەتە ئەمـە بـۆ کـارێك کـە پسـپۆری و شـارەزایی گـەرەك بێـت و ئـەو کاتە تۆ واخۆت پیشان دەدەی کە ئەوان پێویستیان بە تۆیە نەك تۆ پێویسـتت بـە کـار و کرێـی ئەوانـە و دەبـێ خـۆت وا دەربخـەیت کـە تـۆ کێشــە و گرفتـی ئــەوان چارەســەر دەکـەی لــە ئیشـدا و دەبــێ ڕزیومییەکــەت resume، واتــە مێــژووی کارکردن و شارەزایی پێشووت پاڵپشتی گفتوگۆ و پێداگرتنت بێت لەگەڵ خاوەن کـاردا. بـەڵام ئێمـە کـە یەکـەمجار چووینـە ئـەوێ ئەمـەیان نەیگرتینـەوە، چونکـە کاری باش پێویست بـەوە دەکـات زمـانێکی ئینگیلیزیی ئەمـەریکیی - American English پاراو بزانیت و چاك لە گفتوگـۆی زمـانی ڕەشـەخەڵکەکە (عـامی slung) بزانیت و ئێمە لە وڵاتـی خۆمـان، خۆمـان بـە ئینگلیزیزان دەزانـی، کـەچی لـەوێ زۆر دادی نەدایـن، چونکە زۆربەی ئەمەریکییەکان دان نانێن بە قسـەدا و زۆربـەی هەر قووتدەدەن و قورعان بە هەفت کـاتێ ڕەشپێستەکان لـە ناوخۆیـاندا قسـەیان دەکـرد مـن بـە هـەزار حـاڵ شـتێکیان لێتێدەگەیشـتم، بێجگـە لـەوەش لـە هــەندێ ویلایـەتی وەك کالیفۆرنیـا دەبـوو لـە پـاڵ ئینگلیزییەکـەدا ئیسـپانیش بزانـی، کــە زمانی دووەمی ئەو وڵاتەیە، بۆ ئەوەی ئیشی باشت دەست بکەوێت. ئەڵبەتـە گـەڵێ شوێن کارت نادەنێ ئەگەر گرین کارتت نەبێ، واتە بەلای کەمـەوە دووسـێ سـاڵێك لە ئەمەریکا نەژیابێتی.

ڕاسـتێکەی ئێمـە لـە هەوەڵـەوە لووتمـان بـەرز بـوو و بـە پێـی باسوخواسـە نەزەرییەکە حەزمان لە ئیشی باش بـوو. تەنانـەت جارێکیـان تـاقمی کەنیسـەکەی یارمــەتییان دەدایــن بردینیــان بــۆ ئەتڵـەنتا بــۆ لای سپۆنســەری یەکــەمجارمان،

گرووپی کەنیسە لووسەرییەکانی جۆرجیا، چونکە کەنیسەکەی لای خۆمان زۆر کۆڵ بوون لەو بوارەدا. لەوێ بەرەورووی کابرایەکی ئەفغانییان کردینەوە، ناوی عوبێد ڕەسووڵ بوو، گوایە پسپۆڕو شارەزای ئەم بوارەیە. من پێموت کتێبی جینۆسایدم کردووەتە کوردی و حەز دەکەم لە بواری مافی مرۆڤ و بەگژداچوونەوەی ستەم و جینۆسایددا کاربکەم. کابرا بزەیەك گرتی و وتی ئێرە ئەمەریکایە و کارکردن لەو بوارانەدا هێند ئاسان نیە. ئەو کاتە زۆر لەو کابرا ئەفغانییە پەست بووم و وامزانی درۆم لەگەڵ دەکات. بەڵام دواتر و بە ئەزموونی خۆم بۆم دەرکەوت زۆر ڕاست دەکات. ئەڵبەتە لە هەندێ ویلایەت و شار برادەر و دۆستی کوردمان هەبوو تەلەفۆنیان بۆ دەکردین کە تووشی ڕێکخراوی سپۆنسەری باش بوون و تا بە دڵی خۆیان ئیشی باش نەدۆزنەوە ئەمان هەر خەرج و مەسرەفیان دەکێشن. بەڵام ئەمانی ئێمە، ئەگەرچی لە سپۆنسەری خەڵکیتر باشتر بوون، کەچی بەرنامەکەیان بۆ یارمەتیدانی ئێمە هەر سێ مانگ بوو و ئیتر دەبوو خۆمان کار بۆ خۆمان بدۆزینەوە بەڵکو بتوانین ئەو کرێ زۆرەی خانوو و ژیان و گوزەران دابین بکەین. کەنیسەکە بە ئاشکرا پێیان وتین بەرنامەی ئێمە تەواو، ئیتر خۆتان مشووری خۆتان بخۆن. ئەو شارەی منی لێبووم، واتە ڕۆزوێڵ، دەکەوتە بازنەی شار و گەڕەکە پان و فراوانەکانی ئەتلەنتای گەورەوە Greater Atlanta، کە بە پایتەختی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەمەریکایان لەقەڵەم دەدا و ڕووبەرێکی هێجگار گەورەی گرتبوۆوە. لێرە بەو شار و شارۆچکە و ناوچانەی کە دەکەونە نزیك شارێکی گەورە دەوترێ میترۆپۆلیتان و وەك لای خۆمان سیستەمی قەزا و ناحیە نیە و سیستەمی ئیدارەش دوورە لەوەی کە لە فەرهەنگی خۆماندا باوە. ئێرە، واتە میترۆپۆلیتانی ئەتلەنتا، وەك خۆیان باسیان دەکرد ناوچەیەکی گەشەکردوو بوو و تەنانەت خەڵکی ویلایەتەکانی تریشی بۆ دەهات بۆ کارکردن. دەیان بازاڕی گەورە و کارگە و بیزنێسی تێدابوو. هەموو شوێنێك لەوانە کە دەچوویت یان بەلایدا تێدەپەڕیت لە سەر دیوار و جامخانەکانی نووسرابوو "پێویستمان بەخەڵکە بۆ کارکردن" بە گوزارشتی جوانو ناسك، وەك Help Wanted واتە پێویستمان بە یارمەتیتانە، یان Now Hiring واتە ئێستا خەڵك دەخەینە سەر ئیش. ئێمەی نەشارەزا و چاونەکراوە بەم جۆرە جارنامەیە دڵمان خۆش دەبوو، بەڵام کە

دەچووینە ئەو شوێنانە فۆرممان پڕدەکردەوە و چاوەڕێی ئەوە بووین، وەك خۆیان دەیانوت، تەلەفۆنمان بۆ بکەن بۆ چاوپێکەوتن کەچی ئەو تەلەفۆنە هەرنەدەکرا. دواتر کە چاومان کردەوە بۆمان دەرکەوت هەر لە دوکانێکی بچووکەوە بگرە تا کارگە و بازاڕە گەورەکان بەردەوام فۆرمیان لەلایە و خەڵك پڕیاندەکاتەوە و ئەوانیش بە پێی پێویستیی خۆیان و هەر کاتێك کارمەند یان کرێکارێکیان ڕۆیشت فۆرمێك هەڵدەبژێرن و تەلەفۆن بۆ خاوەنەکەی دەکەن. بەردەوامیش خەڵك و بەتایبەتیش ئەوانەی کاری ئاسایی دەکەن کە پێویستی بە پسپۆڕی و شارەزایی زۆر نیە لە پاڵ کارەکەی خۆیاندا فۆرمیشیان لە چەندین شوێن پڕکردووەتەوە و هەر شوێنێك کرێکەی کەمێك زیاتر بوو بۆی دەچن. شیاوی وتنە ئەمە لەو وڵاتەدا زۆر باوە و تۆ ئەگەر لە ئیشێکدا بیت و بەڕێکەوت لە کارێکی باشتر وەرگیرای ئەوە دەبێ پێش دوو هەفتە خاوەن کاری یەکەم ئاگادار بکەیت ئەوجا بۆت هەیە بڕۆیتە سەر کاری دووەم، خۆ دەشتوانی هەر دەسبەجێ وازبێنیت و بڕۆیت بەڵام لەم حاڵەتەدا لەو شوێنە دەکەویتە لیستی ڕەشەوە و بۆت نیە جارێکیتر داوای کاریان لێبکەیتەوە.

بەم ڕەنگە، من لە بازاڕی مارشاڵ وەرگیرام و کەوتمە کارکردن. ئەم بازاڕانە لای خۆمان و لە ئەوروپاش پێیاندەوترێ سوپەرمارکت و لەوێ پێیاندەڵێن ستۆر Store. جا هەیە تایبەتە بە جل و پۆشاك و پێڵاو هەموو بابەتێکی کەمالیات و هەشە تایبەتە بە خواردەمەنی. ئەم جۆرە بازاڕانە زۆر گەورە و بەرفراوانن و دوو بەقەد ڕووبەری خۆیان و زیاتریش پارکی ئۆتۆمبیلی لەبەردەمدایە. یان کۆمەڵە بازاڕێکی جۆراوجۆر لە سەر گۆڕەپانێکی زۆر گەورەی پارکی ئۆتۆمبیلن و بە گشتی بەم کۆمەڵە بازاڕ و پارکە دەوترێ مۆڵ یان پلازای فلانە شوێن، پلازا plaza لە بنەڕەتدا ئیسپانییە و واتای شوێن دەگەیەنێ. بازاڕەکانی جل و پۆشاك، خواردەمەنی، ناوماڵە.. تاد هەموو لە شێوەی کۆمپانیای زەبەلاح و گەورە گەورەدان و لە هەر بازاڕێك دەیان و سەدان جۆری هەمان سیستەمی کار و شێوەی خستنەڕووی شمەك هەن لە سەرتاپای وڵاتەکەدا. بۆ نموونە من لە لقی بازاڕی مارشاڵ Marshals ی شاری ڕۆزوێڵ وەرگیرام کە ژمارەکەی ٣٥١ بوو. لەم جۆرە بازاڕە کە لەبنەڕەتدا هی یەك کەس یان یەك کۆمپانیا بوو نزیکەی ٦٠٠ دانە لە سەرانسەری ویلایەتە یەکگرتووەکاندا هەبوو. هەر لە میترۆپۆلیتانی

ئەتڵەنتا کە منی لێبووم بیست بازاڕی لەم چەشنە هەبوو، بە یەك دیکۆر و یەك سیستەمی کارکردن و هەمان گرووپی کەل و پەل و شمەك لە هەر ٦٠٠ بازاڕەکەدا.

لێرەدا، بۆ بەرچاوڕوونیی خوێنەر و ئاشنابوونی بە کەش و هەوای کارکردن لەم وڵاتەدا، جێی خۆیەتی ئاماژە بەوە بکەم کەوا کارکردن لەم وڵاتەدا بەهایەکی بەرزی هەیە و دەگمەنن ئەو کەسانەی کار ناکەن، چونکە لە سەرێکەوە جۆرە شوورەییەکە کەسێك بێکار بێت و لە سەرێکی تریشەوە ئەگەر کار نەکەیت ناژیت و پارەی سۆشیاڵ یان وێلفێر شتێکی کەم و بێبایەخ بوو لەم ویلایەتەی ئێمە و زۆربەی ویلایەتەکانی تریشدا، هەندێکی لێبەدەر وەك کالیفۆرنیا و نیومەکسیکۆ و کۆنێکتیکەت و چەند ویلایەتێکی باکوور. ئێمە کە خێزانێکی شەش کەسی بووین ئەو دووسێ مانگەی کارم نەبوو ٤١٠ دۆلاریان دەداینێ لە گەڵ نزیکەی ٣٥٠ دۆلار بە شێوەی پسووڵەی خۆراك food stam، لەکاتێکدا کەوا کرێی خانووەکەم بە خەرجی ئاو و کارەبا و گاز و تاد خۆی لە هەزار دۆلار دەدا. ئەڵبەتە هەرکەسێکیش کاری دەست بکەوێ ڕازی نابێت بەو پارە کەمە کە بە هیچ جۆرێ بەشت ناکات. لێرە کارت هەرچییەك بێت کارە و ئیترخەڵك لێت ناپرسێ کارەکەت چیە، کۆڵکێش بیت یان بەڕێوەبەر وەك یەك وایە. جا لەبەر ئەوە زۆر ئاساییە کەسێك بەیانیان لە فەرمانگەیەکی حکومەتدا بەڕێوەبەر بێت و لە سەعات چوار و پێنج بەدواوە تا سەعات ١٠ و ١٢ و نازانم کەی لە کارگە یان بازاڕێکدا، کە هەمووشیان ئەهلین، پاڵ بە عەرەبانەوە بنێت یان گسك بدات یان هەر کارێکی تر بکات.

ئەو دەمە من لەوێ بووم نزمترین کرێی هەر کەسێك لە هەر ئیشێکدا نەدەبوو لە چوار دۆلار و حەفتا و پێنج سەنت کەمتر بێت بۆ یەك سەعاتی کارکردن و پاش ماوەیەك بوو بە پێنج دۆلار و پێموایە ئێستا زیاترە، بە پێی یاسای کارکردنی حکومەتی فیدراڵی لە سەرانسەری ئەمەریکادا. ئەڵبەتە کەس کاری بەو کرێیە نەدەکرد و وەك عورف سەعاتی لە شەش دۆلار کەمتر نەبوو، گەلێ کەس بە هەشت و نۆ و بگرە دە دۆلاریش کاری ئاساییان دەست دەکەوت لە هەندێ کارگە و چێشتخانە و شوێنی تردا. بەڵام بە گشتی لەو بازاڕە گەورانەدا و بۆ کاری عادەتی کە پێویستی بە شارەزایی و پسپۆڕیی نەبوو کرێی سەعاتێك لە نێوان

٦,٥ – ٧,٥ دۆلاردا بوو. ئەمە و هەندێ جاریش فێڵ لە خەڵك دەكرا و كەمتری دەدرایە، بێگومان وەك گرێبەستێك و بە ڕەزامەندیی خۆی. ئەڵبەتە هەندێ كار هەن لەو وڵاتە كرێی زۆر باشیان هەیە وەك فیتەری و بۆیاخچی و ئیشی كارەبا و ئاو بەستن. هەندێك دۆستی من هەبوون كاری فیتەرییان دەكرد و سەعاتی ١٤ دۆلاریان هەبوو. هەر لەو كۆمەڵە خەڵكەی لەگەڵ ئێمەدا چوونە ئەمەریكا هی وایان هەبوو هەل و دەرفەتی زۆر باشی بۆ هەڵكەوت و بە ئاسانی بە پێی شارەزایی و پسپۆڕیی خۆی لە شوێنی شیاودا دامەزرا و هەشیانبوو لە هەندێ ڕێكخراوی ناحكومیی ئەو وڵاتە و كاری باشی دەستكەوت بە پارەی باش.

ئێمە لە گوام و تەنانەت كە لە وڵاتی خۆشمان بووین گەلێ جار گوێبیستی ئەوە دەبووین كەوا ئەمەریكا وڵاتی هەل و دەرفەتە بۆ هەندێ لەوانەی كۆچی بۆ دەكەن و لە هەمان كاتیشدا وڵاتی هەڵپە و ڕەنج و كڵۆڵییە بۆ كەسانی تر. ئێمە ئەو كاتە ئەم قسەیەمان زۆر بەئەقڵدا نەدەچوو كەچی وا ئێستا بە چاوی خۆمان دەیبینین و ڕێكوڕاست وا دەرچوو و ئەولاتریش.

بابێمەوە لای بازاڕی مارشاڵ و كورتەیەك لەو بارەوە باس بكەم. ساڵی ١٩٥٦ بازی بەخت نیشتەوە بە سەر بارۆن مارشاڵەوە لە ویلایەتی مەین لە باكوور و بە بازاڕێكی بچووك دەستی پێكرد و وردە وردە قازانجی كرد و پەرەی بە كارەكەی داو وا ساڵی ١٩٩٧ ە و منی كوردی ڕەهەندەی وڵاتی خۆم و تازە جێگیری وڵاتەكەی ئەو لە بازاڕی ژمارە ٣٥١ ی ئەو پیاوەدا كە ناوی خۆی هەڵگرتووە كار دەكەم نازانم ناوم كرێكارە، كارمەندە، مووچەخۆرە چیەو تەنها بە ئیستیلاحی ئەو بازاڕە مونتەسیب associate یان كلاركم clerk كە لای خۆمان بۆ بنووس یان كاتب بەكاردێت. ئەو شوێنە ٦٠ – ٧٠ كەسێك كاریان تێدا دەكرد و كاری كەسیش قورس نەبوو. سەعاتی كرێكەی من حەوت دۆلار بوو، كارەكەشم پڕكاری یان فوڵ تایم بوو، واتە هەفتەی چل سەعات كارم دەكرد بەڵام نزیكەی پێنج یەكی داهاتەكەم باج دەیبرد و ئەویش لەبەرئەوەی خاوەن منداڵ بووم دەنا بۆ كەسێك منداڵی نەبوایە ئەوە چواریەكی داهاتی بۆ دائیرەی باج بوو. ئەمەو بەشێكی تری بۆ تەئمینی تەندروستی دەچوو، كە دواتر دێمە سەر وردەكارییەكانی. بەڕێوەبەری ئەم بازاڕە پیاوێكی سپی پێستی ئەمەریكیی زۆر بەڕێز و بەئەدەب بوو، هەر لە تەمەنی خۆمدا و ناوی براد جۆنسن بوو، هەندێ باسم لە بارەی

وڵاتی خۆمانەوە بۆ کردبوو، بەڵام کەسێکی ئەمەریکیی ئاسایی هێندە بایەخ بە کێشە و مەینەتیی تۆ و وڵاتی تۆ نادات بەقەدەر ئەوەی بیری لای سەگەکەی و ژیانی تایبەتی خۆیەتی. کە پرسیاری لێکردم و پێموت خەڵکی کوردستانم، بە موجامەلەوە سەرێکی بۆ لەقاندم و لەناخیشیدا ئەم ناوەی لەگەڵ پاکستان، هندستان و ئەفغانستاندا لەلا یەك بوو و تەقەی سەری دەهات لە بارەی ئەم جۆرە وڵاتانەی ئێمە و هەموو ستانەکانیەوە.

# کەم کەس هەیە لە ئەمەریکادا دوو ئیش نەکات

لەم وڵاتەدا پرسیارێك هەیە خەڵك لە یەکتری دەکەن و هێندە دووبارە دەبێتەوە وەك پەندی لێهاتووە ئەویش بەمجۆرەیە "کاری ترت هەیە بۆ ئەوەی پارەی خزمەتگوزاریی پێبدەیت؟"

لێرە مەگەر خەڵکی دەوڵەمەند، کە کاری باشیان هەیەو سەرمایەگوزاری دەکەن بتوانن زۆر باش بژین، دەنا خەڵکە ئاساییەکە بە کۆچبەر و ئەمەریکیی ڕەسەنەوە بەردەوام لە هەڵپەی کارکردندان. گەلێ جار یەك ئیش داد نادات و دەبێ لە شوێنی تر کاربکەیت بۆ مسۆگەرکردنی خەرج و مەسرەف و پارەی دکتۆر و دەرمان. لەبەرئەوە بەردەوام خەڵکەکە ماندووە و لە بەیانیی زووەوە دەچێتە سەر کار و زۆر کەس دوای هەشت سەعاتی کارکردنی سەرەکیی خۆی، پاشنیوەڕوان و شەوان لە شوێنی تر کار دەکات بۆ بەدەستهێنانی پارەیەکی زیاتر و بۆ ئەوەی بتوانێ کرێی خانوو و خزمەتگوزاری و تەندروستی و خوێندن و پۆشاك و خواردن دابین بکات. بۆ ئێمەمانان کارکردنی تاقە کەسێك لە خێزانێکی گەورەدا بەشی ئەو خەرج و مەسرەفەی نەدەکرد. من لەبەرئەوەی چوار منداڵەکەم هیچیان ئەو کاتە نەگەیشتبوونە تەمەنی ١٦ ساڵ، چونکە لەو تەمەنە بەدواوە بە پێی یاسا ڕێگەی کارکردن دەدرێ و لە سەرێکیشەوە هەر هەموویان قوتابی قۆناخەکانی خوێندن بوون، ئەوە بەناچاری هەر خۆم کارم دەکرد و فریای هیچ نەدەکەوتم. دایکی منداڵەکان دەبوو ئاگای لێیان بێت و دوانە وردەکەیان، کە لە قوتابخانە دەگەڕانەوە و لە ماڵەوە دەبوون، دەبوو کەسێکیان لەگەڵدا بێت. بەڵام وا من فریا ناکەوم، ناچار هەر لە بازاڕی مارشاڵ کارێکی سێ چوار سەعاتی ڕۆژانەم بۆ دایکیان پەیداکرد، لەو ماوەیەی کە منداڵەکان دەچوونە مەکتەب. ئەم جۆرە ئیشە پێی دەوترێ پارت تایم، واتە کارکردنی چەند سەعاتێك و پابەند نابیت بە ڕۆژی هەشت سەعات کارکردنەوە. ئەو کارەی دایکیان ڕۆژانە لە کاتژمێر ١١ - ٢ یان زیاتر و کەمتر بوو، بەڵام دەبوو کاتژمێر سێی دوای نیوەڕۆ لە بەردەرگای کۆمپلێکسی نیشتەجێکەمان (گەڕەکەکەمان) چاوەڕێی بکردایە تا پاسی مەکتەب منداڵەکانی دەهێنایەوە و ئەم وەریدەگرتن و لەگەڵیاندا دەگەڕایەوە بۆ شوقەکە. ئەمە خۆی دەردێکی سەخت بوو تووشمان بوو و زۆر بە دەستیەوە دەمانناڵاند. ڕۆژانی شەمە و یەکشەمە بۆ خەڵکی تر پشوودان و حەوانەوە بوو، بەڵام بۆ ئێمە کارکردنی

سەرومڕ بوو. ئێمە هەردوکمان ئەو دوو ڕۆژەمان بە جەژن دەزانی چونکە لە ماڵەوە منداڵە گەورەکان، کە لە قۆناخی ناوەندی و دواناوەندیدا بوون لەگەڵ دوو بچووکەکەی قۆناخی سەرەتایی دەمانەوە و ئێمەش لە سەر ئیش بووین.

ڕاستێکەی ئەمەش دەرینەهێنا و خێزانێکی شەش کەسی دەبوو بەلای کەمەوە سێ کەسیان فولْ تایم، واتە ڕۆژی هەشت سەعات کاربکەن ئەوجا بە باشی گوزەران دەکەن، بەڵام ئێمە یەك و لەتێك کارمان دەکرد و خەرج و مەسرەف و ئەو کرێ خانووە قەبەیەی دەرنەدەکرد، چونکە مانگانە دەبوو زیاد لە هەزار دۆلار کرێی شوقە و خزمەتگوزاری بدەین بەم جۆرەی خوارەوە: کرێ خانوو ٦٨٥ دۆلار، کارەبا ١٠٠ دۆلار، ئاو هاوینان ١٠٠ دۆلار و زستانان ٥٠ دۆلار، غاز ٦٠ دۆلار، تەلەفۆن (تەنها بۆ ویلایەتەکان و کەنەدا و ئەوروپای ڕۆژئاوا) ١٣٠ دۆلار بەڵام ئەو دەمە تەلەفۆن کردن یان فاکس ناردن بۆ کوردستان زۆر گران دەکەوت لە سەرمان و بە کارتی تایبەت بوو، تەماشاکردنی تەلەفزیۆن کە من تەنها لە سی کەناڵدا بەشداریم هەبوو بە کێبڵ ١٥ دۆلار و ئەگەر بتکردایەتە ٦٠ یا ١٠٠ کەناڵ کرێکەی زۆر زیاتر دەبوو. ئەڵبەتە بۆ خێزانێکی وەك ئێمە هەفتانە دەبوو ١٥٠ – ٢٠٠ دۆلار بدەینە خواردن و پۆشاك و پێداویستیی جۆراوجۆریش خەرجی خۆی دەویست و ئەو پارەیەی هەردوکمان لە کارکردن دەستمان دەکەوت زۆر کورتی دەهێنا. ئەمە و گیانیشمان بەوە بوو کە بایی نزیکەی ٣٥٠ دۆلارێکیش مانگانە پیتاقەی خۆراکمان هەبوو Food Stam و لەبەر ئەوەی چوار منداڵی خوار شانزە ساڵمان هەبوو پسووڵەی یارمەتیی تەندروستیمان هەبوو Medic Aid، واتە دوکتۆرمان بەخۆڕایی بوو، دەم و ددانی لێدەرچێت کە ئەوە خۆی لەخۆیدا قوڕبەسەرییەکە بۆ ئەمەریکییەکان خۆیشیان و پڕکردنەوەی ددانێك زیاد لە ٣٠٠ دۆلاری تێدەچێت.

ئەو خێزانە کوردانەی کەوا منداڵی وردیان نەبوو یان خەڵکی ئیشکەریان زۆر بوو، نانیان لە ڕۆندا بوو، چونکە ئەگەر لە ماڵێکی شەش کەسیی وەك ئێمەدا سێ یان چوار کەسیان کاری فولْ تایم بکەن ئەوە بە پارەی دوو کەسیان بە باشی دەژیان. گەلێك لەوانەی خەڵکی ئیشکەریان زۆر بوو هەر یەکە ئۆڤەر تایم، واتە کاری زیادە و بێجگە لە ئیشە سەرەکیەکەشیان ئیشی تری فولْ یان پارت تایمیان دەکرد و لەڕاستیدا ئەگەر کەسێك بیویستایە دەیتوانی لە شەو و ڕۆژێکدا، واتە بیست و چوار سەعات ١٤ – ١٥ سەعات کار بکات و دەشمانبیست هەندێ کورد ١٨ سەعاتیش کاردەکەن و ئەوە بەتایبەتی بۆ کاری فیتەری و کارەبایی و بۆریچی و کاری لەم چەشنە غەزنەیەك بوو بۆ خۆی، کە بە زۆری

مەکسیکیەکان ئەو کارەیان دەکرد. بەلاّم بۆ ئێمەمانان کە دەرەقەتی کاری قورس نەدەهاتین و دەبوایە لە کارگە و بازاڕەکاندا کاری هاکەزایی بکەین، ژیانمان زۆر خۆش نەبوو. ڕاستێکەی ئێمە تووش بووین، چونکە ئەو کۆمەڵە خەڵکەمان کە شەهادەی زانکۆمان هەبوو و لە وڵاتی خۆمان مامۆستا و ئەندازیار و شتی لەم جۆرە و دواتریش لە ڕێکخراوە ناحکومییە لۆکاڵ و نێودەوڵەتیەکاندا کاری باشمان دەست کەوتبوو و بووبووینە جێی بەغیلیی خەڵك خۆشمان دەگوزەراند، کەچی لە ئەمەریکا هیچ حیسابێك بۆ پلەی خوێندن و شەهادەمان نەکرا و وتیان ئەمە ئەمەریکایە و بەخێربێن سەرچاو بڕۆن کار بۆ خۆتان بدۆزنەوە و چۆن ژیانی خۆتان مەیسەر دەکەن بیکەن. ئێمەش دەستێکمان کەوتە ئەملا و دەستێکیش ئەولا، خوا بە زیادی خێرمان نەکرد چیمان بەخۆمان کرد! ئێرە تەنانەت وەك ئەورووپاش نەبوو کە خەڵکە پەنابەرەکە و بەتایبەتی ئەوانەی منالّدارن قاچیان خستبووە سەر قاچ و بۆ خۆیان لە تەڕ دەیانخوارد و لە وشك دەخەوتن و پارەی سۆشیاڵ هەموو شتێکی بۆ دابین دەکردن. کەواتە چارچیە و تازە ڕیش بوو بەڕیشەوە و دەبێ شانەی بۆ هەلگرین.

منێکی ڕۆژهەلاّتیی خوێندنی زانکۆ تەواوکردوو، لە قۆناخێکی ژیاندا مامۆستای دواناوەندی و پاشتریش کارکردن لە ڕێکخراوە ناحکومییەکاندا، ئەگەرچی وەك هەموو یان زۆربەی خەڵکی وڵاتەکەم چەند ساڵێك بە دەست شەڕوشۆڕ و ئابلّووقەی ئابووری و هەژارییەوە نالاّندمان، بەلاّم هەرگیز ئەو ساڵانە پەنای پێ نەبردمە بەر کارێك کە بە کولتووری وڵاتی خۆم کاری من نەبێت و پێی سەغڵەت بم، کەچی ئەمەریکا ئەو کارەی پێکردم و هەر لە یەکەم ڕۆژی کارکردنمەوە لە بازاڕی مارشاڵ لەگەڵ ژنێکی خەڵکی کۆڵۆمبیادا، کە ناوی مارتا بوو و تەمەنی لە پەنجا ساڵ وەبان بوو کاری ڕێکخستنی جلوبەرگ و شمەکیان پێسپاردم، لە کارتۆن دەریبکەین و نایلۆنی لێداماڵین و بە پێی جۆری پیاوانە و ژنانە و منداڵانە جیایانبکەینەوە و پاشان بیاننێرینە نمایشگای بازاڕەکەوە. مارتا ئافرەتێکی ڕووخۆش و سوعبەتچی بوو، ١٥ ساڵ بوو لە ئەمەریکا بوو بەلاّم هێشتا هەرئینگلیزییەکەی تۆزی دەکرد و خواخوای کەسێکی ئیسپانی زمانی بوو بۆ خۆی دەمی لەگەڵ بداتە چەرخ. خەڵکێکی هێجگار زۆری مەکسیکی و ئەمەریکای لاتین ڕوویانکردووەتە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بۆ ژیان و کارکردن، چونکە وڵاتەکانیان چەشنی کاولە وڵاتەکانی ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاستی لەمەڕ خۆمان گرفتاری دەستی حوکمی ملهوڕی و دکتاتۆریی بوون و لە ئەنجامدا بوون بە وێرانە. ئەو خەڵکە زۆرەی

لەویٚ ڕەویان کردووە و زمانیشیان ئیسپانییە، چونکە کاتی خۆی هەموو کۆلۆنیـی ئیسپانیا بوون، بەرازیلی لێبەدەر کە زمانیـان پورتوگالییـە، لـەم ولاتـەدا لـە گـەڕەك و شوێنی کار و خوێندندا بەزۆری پێکەوەن و بە باشی فێری ئینگلیزی نابن. مارتاش یەکێك بوو لەوانە و پـاش پـانزە سـاڵیش لەبـەر ئـەوەی ئینگلیزییەکـەی ڕەوان نـەبوو مـافی هـاولاتیبوونی ئەمەریکای نەدرابوویە، کە بە پێی یاسا دەبوو پاش ٥ – ٦ ساڵ وەریبگریٚ.

بەڕێوەبەری بازاڕەکـەمان، وەك پێشـتر گێڕامـەوە، نـاوی مستەر جۆنسـن بـوو، گەنجێکی سپیپێستی لەسەرخۆ و قسەخۆش بوو، زۆر ڕێزی من و خێزانمی دەگرت چونکە دەسپاك و ئیشکەربووین. کە ئەمەیان دەڵێم لەبەرئەوەیە کەوا لەو ولاتەدا خـەڵکێکی زۆری تەمـەڵ و دەسپیس و دز و بێکەڵك هەبوون و بەداخەوە خەڵکە ڕەشپێستەکەی ئـەو ولاتـە گـەلێکیان لەم جۆرە بوون، هەر چەندە خەڵکی زۆر باشیشیان هـەبوو و گـەلیٚ ژن و پیـاوی ڕەشپێست دۆستی باشم بوون و ئەم خووە خراپەش هۆکاری خۆی هەبوو، دواتر بـە وردی دێمـە سـەر باسکردنی.

# ئەمەیە ئەمەریکا .. بەخێربێن بۆ ئەمەریکا

مارتای هاوڕێم، کە هەموو جارێ من بێزار دەبووم و دەردەدڵی خۆم بۆ دەکرد، لەڕووی تەوسەوە ئەو قسەیەی سەرەوەی پێدەوتم "ئەمەیە ئەمەریکا.. بەخێربێن بۆ ئەمەریکا This is America, welcome to America". نەك مارتا، گەلێ لە ئەمەریکیەکان خۆیشیان هەر ئەم قسەیە دەڵێنەوە و بووە بە وێردی سەر زمانی خەڵك و لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کەوا کەسانێکی زۆری سەر ئەم گۆی زەویە چوونە ئەمەریکا بە خەون و خەیاڵێکی خۆش دەزانن و ئاواتەخوازن ڕۆژێ لە ڕۆژان بەدیبهێنن. کاتێکیش بازی بەخت بە سەریانەوە دەنیشێ و دەچنە ئەو وڵاتەوە و لووتیان لە بەردی واقیعە تاڵەکە دەدا تووشی شۆك دەبن و بە دەست مەینەتی کار و کارپەیداکردنەوە گرفتار دەبن و پاشان وردە وردە تێکەڵی ئەو ژیانە پڕمەینەتییە سەیر و سەمەرەیە دەبن و بۆ خۆیان ئاشی کار و ژیان دەیانهاڕێ و لە هەزارا یەکیش بۆ خۆی پێدەگات و دەبێتە ملیۆنێر! سەیر ئەوەیە ٩٩٩ کەسەکەش هەر بەو خەیاڵەوە دەڕەتێن و تا ڕۆژی نەفخی سوور هیچیان بە هیچ نابێت!

لە مارشاڵ، هەرچەندە پەگی ئەو پیرەژنە ڕەقەڵە پیسەی جێگری بەڕێوەبەری بازاڕەکە بوو لەگەڵمان خراپ بوو، بەڵام مستەر جۆنسنی بەڕێوەبەری گفت شیرین و قەشەنگ هەتا بڵێی دڵنەوایی دەکردین و قەرەبووی ڕەفتاری ناشیرینی پەگیی ڕیوەڕیوکەری بۆ کردبووینەوە. ئەم پیاوە چاوترووکانێك چیە لە سەر کورسی دانەدەنیشت و بەردەوام لە ڕەفەکاندا کاڵا و جل و پێڵاو و کەمالیات و تەتکە و لەرزانەی ڕیزدەکرد، کە بەردەوامیش مشتەرییەکان بە سەر یەکدا تێکیاندەدا و دەیانشێواند لە کاتی تاوتوێکردنیاندا بە مەبەستی کڕین و کەسیش نەیدەتوانی پێیان بڵێ وا مەکەن نەوەك دڵیان بڕەنجێ و لە بازاڕەکە بتەکێنەوە. بەیانیان سەعات نۆ بازارەکە دەکرایەوە و ئەو لە سەعات هەشتەوە لەوێ بوو بە دەستی خۆی گسکی دەدا و مێزو ڕەفە و ئاوێنەی پاکدەکردەوە و لە هەر کەسێکی کارمەندی ئەو بازاڕە زیاتر ئیشی دەکرد و دیاربوو بەرپرسەکانیشی زۆریان بەدڵبوو، چونکە دواتر بیستمەوە کراوە بە بەڕیوەبەری ئیقلیمیی هەموو بازاڕەکانی مارشاڵ لە ناوچەی ئەتڵەنتادا کە ژمارەیان زیاد لە بیست بازاڕ بوو.

بەیانیانێکیان من کەمێك زووتر ڕۆیشتم و تەماشام کرد مستەر جۆنسن ماسیحەی بە دەستەوەیە و خەریکە کاشیی بازاڕەکە دەسڕێ و دوای بەیانی باش وتی محەمەد نایەی پارمەتییەکم بدەیت و گسکم لەگەڵ بدەیت؟ ئەلهەقی منیش لەو ساتەدا دەمار گرتمی و بە مۆنییەکەوە لێی چوومە پێشەوە و بە تووڕەییەوە وتم تۆ سەعاتی چەند کرێ بە من دەدەی؟ کابرا بە سەرسوڕمانێکەوە وتی حەوت دۆلار، بۆ ئەو بەرپرسیارە دەکەی!؟ وتم نەك حەوت دۆلار لە سەعاتێکدا، حەوت سەد دۆلاریشم بدەیتێ من ئەو کارە ناکەم، چونکە لە وڵاتی ئێمە و کولتووری ئیمەدا ئەوە تەنها کاری ژنە و بۆ پیاو عەیبە بیکات. لێرەدا زۆر دڵی دامەوە و داوای لێبووردنی لێکردم و وتی مەبەستم هیچ نەبووە و لێرە تەنها پیاو گسك دەدا و بۆ ژن عەیبە ئەو کارە بکات. با ئەوەش بڵێم لەوێ ژن چێشتیشی لێنەدەنا، بەڵکو ئەگەر لەماڵەوە چێشتیان لێبنایە، ئەوە پیاو ئەو کارەی دەکرد. مستەر جۆنسن تا هەفتەیەك هەموو ڕۆژێك پۆزشی بۆ دەهێنامەوە لەبەر ئەوەی بەو قسەیەی ئەو نیگەران بووم.

وەك پێشتر ئاماژەم بۆ کرد، لە هەموو بازاڕ و کارگە و شوێنێکی کارکردندا بەردەوام کۆمەڵێك فۆرم دانراوە و خەڵکی جۆراوجۆر دەچن پڕیدەکەنەوە و بە تەمان ڕۆژێك تەلەفۆنیان بۆ بکرێت و پاش چاوپێکەوتن لەو کارە وەربگیرێن. لەمەدا کەس بە شوێنێك و دوان و سیانەوە ناوەستێ و بەردەوام لە ئیش گۆڕیندایە و بە تایبەتی ئەوانەی کە هێشتا جێگیرنەبوون و بە دوای ئیشی باشتردا دەگەڕێن. ئەڵبەتە باشتر لەڕووی کرێ و بارودۆخی کارەوە. لە هیچ شوێنێکیش کەس بۆی نیە ڕێگریت لێبکات ئەو ئیشە بەجێبێڵێت و تەنانەت بۆی نیە پێت بڵێ بۆ. خۆ ئەگەر لە پێش دوو هەفتەدا خاوەن یان بەڕێوەبەری کار ئاگادار بکەیتەوە بۆت هەیە هەرکاتێکی تر ویستت لەو شوێنە ئیش بکەیتەوە فوڵ یان پارت تایم بێت. لە کلێشەی فۆرمەکانیشدا نووسراوە ئێمە کار بە هەموو کەس دەدەین بێ جیاوازیکردن لە ڕەنگ و ڕەگەز و ڕەچەڵەك و ئاین و زمان و کورە نازانم هەزار شتی تردا و ئەڵبەتە ئەمەش بە پێی قانوونی حکومەتی فیدراڵییە لەو وڵاتەدا کەوا هەموو کەس بۆی هەیە کاربکات بە بێ جیاوازی. من لێرەدا مەبەستم کاری سپییە کە هەر پێت نایە ئەو وڵاتەوە کارتێکت دەدرێتێ بە ناوی کارتی مۆڵەتی کارکردن .Employment Authorization Card

بەڵام هەندێ برادەر و دۆستمان لە کالیفۆرنیا پارەی سۆشیاڵیشیان وەردەگرت و لە پەناوە هەندێ کاریشیان دەکرد، بە دزیی دەزگای کۆچەوە، کە ئەمەیان پێی دەوترێ کاری

ڕەش. لەو وڵاتەدا هەموو پەنابەرێك یان كۆچبەرێك لـە فەرمانگەی كۆچەوە كەسێكی بۆ دیاری دەكرێت بەتایبەتی موتابەعەی ئەوە بكات ئایا كاری هەیە یان نە. كە كـارت نەبوایـە شتێكی كەمی مەمرە و مەژییان دەدایتێ و هەر كە كارت دەسـتكەوتایە و داهاتت كـەم یـان زۆر بوایـە دەیانـبڕی و ئەمـەیان وەك ئـەوروپا نـەبوو بـۆت هاوتـا بكەنـەوە. بـەم كەسـەش دەوتـرا كـەیس ووٚركـەر Case Worker و بەگشـتی ئـەم جۆرە كەسـانە جێـی ڕق و بـێزی پەنابـەر بـوون و پـتر لـە سـیخوڕ دەچـوون وەك لـە پارمـەتیدەر. كـەیس ووٚركەرەكـەی مـن كابرایەكی كەمبۆدی بوو ناوی سۆخان كات بوو، پیاوێكی زۆر بەدفەساڵ و هیچوپووچ بـوو، یەكەم ڕۆژ كە بیسمیلام لە كارە كەمدەرامەتەكەم كرد ئـەو پـارە كەمـەی بـڕی كـە دەزگـای كۆچ دەیانـدامێ.

ڕاستە بە پێی قانوون كەس بۆی نـەبوو فۆرمـت لێوەرنـەگرێ بـەڵام خـاوەن كـار كـەیفی خۆی بوو پاشتر تەلەفۆن بۆ كێ بكات و كێ وەربگرێت. لەم بوارەدا ڤێتنامی و كـەمبۆدی و چینـی و كـۆری بـەخت یاوەریـان بـوو و ئـەمڕۆ فۆرمـی پڕبكردایەتـەوە بـۆ سـبەینێ وەردەگیرا و بەتایبەتی ڤێتنامیەكان كـە زۆر ناوبـانگێكی باشیان هـەبوو لـە بـواری پـاكی و دڵسۆزییان لەكاردا و پیاو ڕاست بڵێ هـەر هـەموو ئاسـیاییە چاو تەسكەكان لـە كـاركردندا چەشنی مێروولە بوون.

منیش، وەك هەر كەسـێك لـەو وڵاتـەدا بـژی، لـە چـەند شـوێنێك فۆرمـم پڕكردبـۆوە و ڕۆژێكیـان لـە بـازاڕی كرۆگـەرەوە Kroger تەلـەفۆنیان بۆكـردم و چـووم چـاوم كـەوت بەخانمێكی قەڵەوی بەڕێوەبەری ئەو بازاڕە و لەگەڵی كەوتمە دانوستانی چۆنێتی كاركردنم وەك كاشێر (ژمێریار) لەوێ و سەعاتی بە حەوت دۆلار و نیو، بە فوڵ تایم و بـەیانیان لـە كـاتژمێر دەوە بـۆ هەشـتی ئێـوارە و هـەندێ ڕۆژیـش لـە كـاتژمێر دووەوە بـۆ دەی شـەو. ئەڵبەتـە مـن ڕۆژانـە دەبـوو هەشـت سـەعات و نیـو كـاری فیعلـی بكـەم، كـە نیـو سـەعات پشوودانی نانخواردنە لە سەر حیسـابی خـۆم و لـەو ماوەیـەدا خـاوەن كـاریش یـەك چارەك پشووت دەداتێ لە سەر حیسابی شوێنەكە، واتە بۆت حیسـابە و بـۆ هـەردوو كاتەكـە دەبـوو كارتی كاركردنت بهێنایە بە ئامێرێكی كۆمپیوتەریدا بۆدیاریكردنی كاتی كاركردنت.

نیو سەعاتەكەی پشوودان ئیلزامی بوو بەپێی یاسای كاری حكومەتی فیدراڵی و نەدەبوو لەوە كەمتر وەربگریت و ئەگەر ئەو نیو سەعاتە ٢٨ یان ٢٩ دەقیقە بوایـە كێشـەی قـانونیی بۆ دروست دەكردن و دەبوو بە كۆمەڵێ ئیمزا و ئیمزاكاری چـاك بكرایەتـەوە، بـەڵام دەكـرا ٣٥ دەقیقە وەربگریت و كێشە نەبوو هەرچەنـدە لەوە زیاتر بوایە، واتـە لـە نیـو سـەعاتەكە

ئەوە لە حیسابی خۆت دادەشکا و بێجگە لەوەش بەچاوی کەسێکی ئیشکەری باش تەماشا نەدەکرای.

ئەمە لە مارشالْ و کرۆگەر و هەموو شوێنێکی تر وابوو. بەهەرحالْ داوای مۆڵەتی دوو هەفتەم کرد و ئیدارەی بازاڕی مارشالم ئاگادار کردەوە کە لە هەفتەیەکدا چەند سەعاتێکی پارت تایم لای ئەوان وەردەگرم و کاری فولْ تایمم دەگوێزمەوە بۆ شوێنێکی تر. لەو ماوەیەدا چەند ڕۆژێك خۆم ڕاهێنا لە سەر ئامێری کۆمپیوتەری کاشیەری و پاش تەواوبوونی ماوەکە چوومەوە بۆ لای بەڕێوەبەری بازاڕی کرۆگەر، کە بازاڕێکی زۆر گەورەی خواردەمەنی بوو بیست و چوار سەعات دەرگای کرابۆوە و قەرەباڵغ بوو. بە بەڕێوەبەرم وت من ئامادەم و ئەویش دوو ڕۆژ دواتری دیاریکرد بۆ دەستبەکاربوونم. لەم دانیشتنەدا خانم زۆری موجامەلە کردم و پرسیاری لێکردم خەڵکی کام وڵاتم و کاتێ وتم کوردستان زۆر گەشایەوە و وتی زۆر چاکە دووسبەی چاوت بە هاوڵاتییەکی خۆت دەکەوێت و بە هەمان زمانی تۆ دەئاخڤێ و لێرە کار دەکات، منیش زۆر دڵخۆش بووم بەوە و لە دڵی خۆمدا وتم چی لەوە خۆشترە هاوڕەگەزێکی خۆتت لەگەڵ بێت!

ڕاستێکەی لەم شارەی من، واتە ڕۆزوێل، بێجگە لە ماڵە ناسیاوەکەم یان بابڵێین خزمەکەم کە لە ماڵی مستەر سنۆ بەیەکەوە بووین و ئەوانیش گەنج و بێ منداڵ بوون و بەردەوام لە کارکردن بوون و بە کەمی یەکترمان دەبینی، هیچ ماڵە کوردێکی تر نەبوو. پەیوەندی من بە کوردەکانی دۆستمەوە زیاتر بە تەلەفۆن بوو و جارجارەش لەگەڵ ماڵی کاك شیروان و کاك هوشیار و چەند دۆست و برایەکی تردا کە لە باشووری ئەتڵەنتا بوون و هاتوچۆیەکی درەنگ درەنگی یەکترمان دەکرد بە پێی ئەو دەرفەتە کەمەی کەوا کاری بەردەوام بۆی هێشتبووینەوە. پەیوەندیشمان لەگەڵ ئەودوای برادەرەکانماندا کە لە زۆربەی ویلایەتەکاندا پەرشوبڵاو بووبوونەوە، هەر بە تەلەفۆن بوو. هی واشبوو گرفتاری دەردی خۆی بووبوو و پاش ماوەیەك وازی لەو تەلەفۆن کردنەش هێنا.

# ژمێریـــار لە بـــازاڕی کـــــرۆگـــەردا

غەریبی دەردێکی هێند سەختە لە گێڕانەوە نایەت و تەنها ئەو کەسە هەست بە تـاڵی و ناسۆریەکانی دەکات کە خۆی بینیبێتی، دەنا هەزار ساڵ باسی بکەیت کـەس لێت تێناگات. ئێمە لـە ڕۆزوێـڵ دەتـوانم بڵێم تاقە ماڵی کورد بووین، چونکە ماڵەکـەی تـر بـەردەوام سەرقاڵی کار بوون و کەم دەبینران. وامـان لێهاتبوو عـەرەب و فارس و تەنانـەت هنـدی و پاکستانیشمان بە کەسی خۆمان دەزانـی. کەواتـە چی لـەوە خۆشترە بچیتـە سـەر کارێك و خاوەن کار پێت بڵێ دووسبەی وەرەوە دەستبەکاربە و هاوڕەگەز و هاوزمانێکی خۆشت لێرە کاشێرە و ئەگەر پێویستت بوو یارمەتیت دەدا و بێجگە لەوەش کارەکە خۆی لەخۆیدا بـاش بێت و بە ئاسانی دەست هەموو کەس نەکەوێت. وا خواخوامە دووسبەی زوو بێت و بـزانم ئـەم هاوڕەگـەزە کوردەم کێیـە و ڕۆژی دیـاریکراو ئامـادەبووم و خـانمی بەڕێوەبـەر لەگـەڵم هـات و لەگـەڵ مستەر جاندرا ڕامـش بـە یـەکتری ناسـاندین و وتـی: ئەمـەش هـــاووڵاتی و هاوزمانی خۆتە. هەردوکمان لە گەڵ تەوقەکردندا دەستمان کـردە پێکـەنین و وتمـان خـانم هندسـتان و کوردسـتان حـەوت سـاڵە ڕێ لـە یەکـەوە دوورن. وادیـارە خـانم وەك هـــەر ئەمەریکییەکی گەوج جیاوازیی نێوان وڵاتە پاشکۆ ستانەکان ناکات و هـەمووی لـەلا هـەر یەکە. ڕامـش پیـاوێکی شـکۆداری سـەر مـاش و برنـج و لـە شـاری بۆمبـای قـازی بـووە و خەون و خەیاڵی ئەفسووناویی ئەمـەریکا کەمەنکێشی کردبوو. ئەلهـەقی هەرچـەندە وەك زۆربەی هندییەکان کەللەڕەق بوو، بەڵام پیاوێکی باش بوو و لە سـەرەتای کارەکـەمدا زۆری یارمەتی دام.

بەمجۆرە من ڕۆژانە هەشت سەعات و نیوم لە کرۆگـەر بەسـەردەبرد و پاشـانیش دەبوو بە پاس بچوومایە بۆ مارشاڵ و لەوێش ٣ – ٤ سەعات کارم بکردایە و بـە هـاتوچۆوە دەبوو ڕۆژانە ١٣ – ١٤ سەعات کارم بکردایە و شەو سەعات دە کە دەچوومە ماڵەوە هەناسەم لەبەر بڕابوو و شلکوتی عـەمرم کرابوو. ڕاستە کاشـێریی کـارێکی باشـە، بـەڵام ڕەنگـە خوێنـەر وابزانێ من لە پشتی ئامێرێکی کۆمپیوتـەرەوە لـە سـەر کورسییەك دانیشتووم و ناوبـەناو کەسێك دێت هەندێ شتی کڕیوە و پارەکەیم دەداتێ، یان پارەیەکم دەداتێ و باقیەکـەی بـۆ دەگێڕمـەوە و ، ۆ خـۆم دادەنیشمەوە و ئـاو بێنـە و دەسـت بشـۆ. ئەمـە لـە وڵاتـی خۆمـان ئاوهایە و کەس ناهەقی نیە وا بیربکاتەوە. بەڵام وا دەرنەچوو، چونکە ئەو بازاڕە نەگریسە

هێندەی گەڕەکێك دەبوو، ئەمسەر و ئەوسەری دیارنەبوو، لە خواردن و میوە و سەوزە و کورد واتەنی سەری مار و شیری چۆلەکەشی تێدابوو، بەردەوام جمەی دەهات لە خەڵکدا و بازاڕیان دەکرد و عەرەبانەیان پڕ دەکرد و دەیانهێنایە بەردەمت و تەواوی ئەو بازاڕە نەهەنگە دەهاتنە بەردەمی ١٠ – ١٢ کاشێر و لە بەردەمی هەر یەکەماندا هیچ کاتێك لە دە دوانزە عەرەبانە کەمتر ڕیز نەبووبوون و ئەمە تەواو دەبوو ئەوەندەی تر ڕیز دەبوون و دەرفەتی هەناسەدانیش نەبوو. دەبوو ئێمە بەردەوام بۆ ماوەی هەشت سەعات بە پێوە ڕاوەستین و بۆ تەنها یەك دەقیقەش بواری دانیشتن نەبوو. هەر هەموو مەعمیلەکانیش دەبوو بە ڕوویەکی خۆشەوە پێشوازیی بکرێن و یەك بە یەك شمەکەکانیان بکێشرێت یان بە ئامێرێکی لیزەریدا بهێنرێت و زیکەی لێهەڵسێت و لەوسەری مێزەکەوە پیرێك یان مێرمنداڵێکی سەروو شانزە ساڵ بۆیان بکاتە کیسەوە و لە عەرەبانەکەدا ریزی بکات و ئەگەریش پێویستی کرد بۆی بباتە دەرەوە بۆ لای ئۆتۆمبیلەکەی و بۆی بار بکات. خەڵکی ئەو وڵاتە بە چەندین شێوە پارە دەدەن و کەمجار کاشە، ئەویش مەگەر مەکسیکییەك یان کۆچبەرێکی تازە هاتوو، دەنا خەڵك بە چەك و ATM و کرێدیت کارت Credit Card و شتی تر پارەیان دادە. جاری وا هەیە بایی ١٥٠ دۆلار شتی کڕیوە و چەکێکت بۆ دەنووسێ بە ٢٠٠ دۆلار و تۆ دەبێ چەکەکەی لە ڕێگەی کۆمپیوتەرەکەتەوە بەراورد بکەیت لەگەڵ حیسابی بەنکەکەیدا کە بە تۆڕێك گرێدراوی هەموو حیسابی خەڵکی وڵاتەکەیە و پاشان ئەگەر ڕێك و بێگرفت بوو پەنجا دۆلاریش باقی بدەیتەوە، خۆ ئەگەر گرفت هەبوو دەبێ دەسبەجێ بەرپرسەکەت ئاگادار بکەیتەوە نەوەك چەکەکە ساختە بێت و فێڵت لێبکات. لە هەمان کاتیشدا دەبێ ئاگاداری پارە کاشەکانت بیت و هەر هەڵە و ناتەواوییەك بەرۆکی خۆت دەگرێت و دەبێ بیبژێریت. لەبەر ئەوە ناچاری هەر چاوێکت بکەی بە هەزار چاو و پاش تەواوبوونی شەفتی کارەکەت لەگەڵ بەرپرسەکەت حیساب دەکەیت و ئەگەر هەڵەیەکت کردبێ خۆت بەرپرسیاری. لە سەرێکی تریشەوە ئەرکی کارەکەت ئەوەت دەخاتە سەرشان کەوا دەبێ هەمیشە دڵی مشتەری ڕابگریت و بە هیچ جۆرێك هەستی نەڕووشێنی دەنا لەو شوێنە دەتۆرێ و ڕوو دەکاتە بازاڕێکی تر. لە بازاڕەکەدا بەرپرسێکی کۆمپیوتەری کاشێرەکان هەبوو هەر کامێکیان بە هۆی چەك یان ژمارە حیسابێکی گوماناوییەوە تێکچوایە خێرا بانگت دەکرد override و ئەویش تە دەمتەوە دەهات.

لە مارشاڵ کە بازاڕی جلوبەرگ و کەمالیات بوو جاری وابوو دوای دوو هەفتە بگرە زیاتریش جلیان دەهێنایەوە و لێیان وەردەگرتنەوە و بە کوڵێ سوپاسیشەوە پارەکەیان

دەدانەوە هەر لەبەر ئەوەی نەڕەنجێن و نەچنە شوێنی تر. لە بازاڕە زەبەلاحەکەی کرۆگەر بۆ خواردەمەنی کە بیست و چوار سەعات دەرگای کراوە بوو، لەم موجامەلە و موجامەلەکارییەدا دەبوو هەر کەسێ بە عەرەبانەکەیەوە بهاتایەتە بەر مێزەکەت بەخێراتنێکی گەرمت بکردایە و پاشانیش خواحافیزییەکی دۆستانە و حیسابی بەیانی و نیوەڕۆ و ئێوارە و پشووی هەفتە و جەژن و بۆنەکانت بەچاکی ڕەوان بوایە. ئەمەریکی ئادابی موجامەلەیان زۆر خۆشە و لە گفت و لفتا پیاو خەجاڵەت دەکەن و لای خۆمان واباوە ئێرانیەکان ئەو بەزمەیان زۆرە کەچی لەچاو ئەوەی ئەمەریکادا زۆر کەمە. بۆ نموونە کاتێ کە بەڕێیدەخەیت ئەگەر بەیانی بوو دەبێ بڵێی بەیانییەکی خۆش، ئەگەر نیوەڕۆ بوو نیوەڕۆ ئەگەر کۆتایی هەفتە بوو واتە شەمە و یەکشەمە دەبێ بڵێی have a nice weekend واتە کۆتایی هەفتەت باش، ئەگەر بۆنە و جەژن بوو دەبێ ناوی بۆنەکە بێنیت ئەوەندە ئەم ڕستانەم دەوتەوە و چاویشم لە شاشەی کۆمپیوتەری حیسابەکەمەوە بوو گەلێ جار هەڵەی خۆش خۆشم دەکرد و بەوەی کە تازە دەهاتە بەر مێزەکەم بۆ ئەوەی کاری بۆ ڕایی بکەم لێم تێکدەچوو لەجیاتی بەخێراتن خواحافیزیم لێدەکرد و لەو ناوەدا دەبووە بزە و پێکەنین. لەمەدا هەموومان، تەنانەت ئەمەریکییەکانیش، ئەو دەردەمان تووش دەبوو و بووبووینە ئامێری ڕیکۆردەر و بەردەوام بەخێربێی خواحافیزت بێ بووبووە ویردی سەرزارمان جا تۆ بیهێنە بەرچاوی کەسێك تەمەنی ٤٥ ساڵ بێت و نەخۆشی فەقەراتی بێت و بۆ چاوترووکانێکیش بێت دەرفەتی دانیشتنی نەبێت بۆ ماوەی هەشت سەعات، دەبێ چ حاڵێکی بێت و بڕواتان بێت گەلێ جار تاریکایی دەهات بە سەر چاومدا و خۆزگەم بە مەرگی خۆم دەخواست.

ڕامش تەمەنی شەست و حەوت ساڵ بوو، هەندێ جار سوعبەتمان پێکەوە دەکرد و پێمدەوت ڕامش من و تۆ هەردوکمان بێئەقڵ بووین کە هاتینە ئەم وڵاتە، من پێشتر مامۆستای سانەوی و دواتر لە ڕێکخراوی ناحکومیدا کارم دەکرد و تۆش لە وڵاتی خۆت قازی بوویت، ئاخر چی ئەم گەوجێتیەی پێکردین؟ خۆ بەخوا خۆشمان بکوژین تازە کەسمان لەم وڵاتەدا دەوڵەمەند نابین، ئەویش بە تەوسەوە قسەکانی دەسەلماندم و دەیوت Welcome to America واتە بەخێربێن بۆ ئەمەریکا. گیانمان بەوە بوو کچی جوانی لێبوو گەلێکیان بە قەولی ئەهلی سلێمانی سەرولەبز شیرین بوون. هەر لەو کارەمدا ژنێکی هندی، کە ئەویش کاشێر بوو و ناوی ئانی گۆز بوو، بووبووە هاوڕێم. ئانی تەمەنی ٤٧ ساڵ بوو، لە هندستان مێردەکەی مردبوو ئەمیش کۆچی کردبوو بۆ ئێرە و لەگەڵ دوو کچیدا دەژیا کە

هەردوكیان لە زانكۆ دەیانخوێند و كوڕێكیشی هەبوو لە لەندەن دەژیا. ئانی هێشتا جوان بوو لەگەڵ ئەو تەمەن و بێوەژن كەوتنەشیدا بەلام هەستی بە بۆشاییەكی دەروونیی گەورە دەكرد لە ژیانیدا و بەو پێیە حەزی دەكرد پیاوێكی هەر هیچ نەبێ نزیك لە كولتوورەكەی خۆی خەمەكانی بلاوێنێتەوە و لەم سۆنگەیەوە زۆری حەز لە دۆستایەتی من دەكرد و ڕەنگە لە ناخیشیدا حەزی لە پەیوەندییەكی سۆزداریی كردبێ لەگەڵمدا و چەند جارێك كە پێكەوە دەبووین لە كاتی ئیش یان پشوودا و بەرێكەوت كچەكانی دەهاتن زۆر لێیان دەترسا و دەپەشۆكا. پیاو ڕاست بڵێ منیش لە ناخەوە زۆرم خۆشدەویست و بەزەییشم پێدا دەهاتەوە بەلام هێندە خەم سواری سەرم بووبوو تاقەتی خۆشەویستییەكی هندییانەی چەشنی فیلمەكانی "سەنگام" و "دووبەدەن"م نەبوو كە لە تافی لاویمدا لە سینەمادا بینیبوومن.

ماوەی شەش حەوت مانگ لە سەر ئەو كارە مامەوە و لەو ماوەیەدا لە ڕۆژنامەدا دەمخوێندەوە كەوا چەند حاڵەتێكی كاشێر و ژمێریار كوشتن و پارە فڕاندن لە ئەتڵەنتا و دەوروبەریدا ڕوویدابوو. كارەكەی منیش لە هەفتەیەكدا وا دەكەوتەوە كە دوو ڕۆژی تا كاتژمێر دەی شەو بمێنمەوە و ئەمەش مەترسیی خۆی هەبوو، لە وڵاتێكدا كە ئەگەر پۆلیس نەبوایە پیاو پیاوی دەخوارد. ناچار بیرم لەوە كردەوە كە بچمە شوێنێكی تر و بۆ ئەو مەبەستە فۆرمێكم لە بازاڕێكی گەورە پڕكردەوە، بە ناوی برلنگتن Birlington Coat Factory. ئەمەش وەك مارشاڵ بازاڕی جل و بەرگ و كەمالیات بوو، بەلام زۆر گەورەتر بوو. پاش بەینێك لەم كارە وەرگیرام هەر بەحەوت دۆلار و نیو لە سەعاتێكدا و ئیشەكەم ئەوەبوو سەرپەرشتیی بەشی پۆشاكی پیاوانەی بازاڕەكە بكەم.

كاتێ بەرپرسەكەم لە پێش دوو هەفتەی كاربەجێهێشتندا لە كرۆگەر ئاگادار كردەوە زۆری پێناخۆش بوو و بەڵێنی پێدام كرێكەم بۆ بكاتە هەشت دۆلار لە سەعاتێكدا ئەگەر بمێنمەوە، بەلام داوای بەخشینم لێكرد و هاتمە بازاڕی برلنگتن بە پەنجا سەنت كەمتر، بەلام ئەمینتر و نزیكتر لە ماڵی خۆمانەوە كە بە پێیان هاتوچۆم دەكرد، چونكە ئۆتۆمبیلم نەبوو. لێرەش هەشت سەعات كارم دەكرد و ٣ – ٤ سەعاتی تری كاركردنی ڕۆژانەشم هەر لە مارشاڵ هێشتەوە.

# جارێکیتر سەنگەری کار گواستنەوە

برلنگتن کۆت فاکتۆری Birlington Coat Factory و کەی مارت K-mart دوو بازاڕی زۆر گەورە بوون لەم وڵاتەدا، کەوا سەدان لقیان لە سەرانسەری ئەمەریکادا هەبوو. هەردوکیان هی کەمالیات و جلوبەرگ و پێلاوبوون و لەگەڵ یەك دوو بازاڕی لەخۆیان بچووکتردا و پارکێکی فێرتاوکراوی ئۆتۆمبیل لە بەردەمیاندا ڕووبەرێکی زۆر بەرفراونیان گرتبۆوە. من حەزم دەکرد لە کەی مارت کارم دەست بکەوێ چونکە ئانی گۆزی هاوڕێشم لە کرۆگەرەوە هاتبووە ئێرە، ڕاستێکەی هاوڕێتیەکەی من و ئانی زیاتر هاوخەمی و هاومەینەتی بوو. کەی مارت بێجگە لە جلوبەرگ بازاڕێکی گەورەی خواردنی قوتووکراوی مرۆڤ و هێندەی ئەوەش هی سەگ و پشیلەی لێبوو. بەشێکی گەورەی بازاڕەکەش هی نەمام و گوڵ و کەرەستەی کشتوکاڵی بوو. بازاڕی برلنگتنی تەنیشتیشی، کە من کارم تێدا دەستکەوت، سووکە شارێك بوو بۆ خۆی. ئەمیش بەڕێوەبەرەکەی و ستافی ئیدارەکەی کۆمەڵە خەڵکێکی باش بوون. لێرە کارەکەم سووك و ئاگاداریی بەشی پۆشاکی پیاوانم پێسپێردرابوو. ئەڵبەتە لێرەش هەر لە بەڕێوەبەرەوە تا دەگاتە هەمووان کەس کوێخا نیە لە سەر کورسی دانیشێت و خەڵکی تر کار بکات. لێرە هەموو کەس وەك پوورە هەنگ سەری کردبووە جلوبەرگ و کەمالیات ڕێکخستن کە بەردەوام کڕیار دەیانشێواند. لەم بازاڕانەدا کراس و قاتی پیاوان و ژنان و منداڵان و هەموو جۆرە جل و پۆشاکێکی تر ئەوە نەبوو لە پاکەت یان نایلۆندا بێت، بەڵکو لە گەنجینەی بازاڕەکەدا هەر هەمووی لە کارتۆن و پاکەت و نایلۆن دەردەکرێت و لە ڕەفە و شوێنی تایبەتیدا هەڵدەواسرێت و کڕیار دەیانباتە شوێنی خۆگۆڕین و تاقییاندەکاتەوە و ئەوەی دەیکڕێ دەیکڕێ و ئەودواشی بە پەرتوبڵاوی لە شوێنی خۆگۆڕین و پێشانگاکەدا بەجێدێڵێت و کارمەندی بازاڕەکەش بەردەوام ڕێکیاندەخەن و فریا ناکەون.

ئێرە بازاڕێکی زۆر گەورە بوو و نزیکەی ١٥٠ کەسێك کاری تێدا دەکرد. کاری من لێرە ڕۆژانە لە سەعات هەشتی بەیانییەوە بۆ چوار و نیوی دوای نیوەڕۆ بوو، واتە ڕۆژی هەشت سەعات بێجگە لە نیو سەعاتی پشوودانی نانخواردنی نیوەڕۆ کە لە

سەرخۆمان بوو و پارەی نەدەدرا و پێش ئەوەش چارەکێکی ترمان وەردەگرت کە ئەوەیان لە سەر خاوەن کار بوو واتە پارەی دەدرا. ئەو بەشەی ئێمە پێنج کەسی لە سەر بوو، منی کورد، ئەلێکسی رۆمانی، پۆڵی ڕووس، جانگی بە ڕەچەڵەك کۆری و ویلی ڕەشپێست کە لە ویلایەتی مەشیگانەوە هاتبوو، بێجگە لە چەند ژن و پیاوێکی تر کە لای ئێمە و بەشەکانی تری بازاڕەکە کاریان دەکرد. لەم بەشەدا کابرایەکی ئەمەریکی سپیپێست سەرپەرشتی دەکردین کە ناوی ڕاندال بوو و بۆ کورتکردنەوە پێیاندەوت ڕاندی. ئەم ڕاندییە پیاوێکی ڕەقەڵەی سوورشێی تەمەن نزیکەی ٥٠ ساڵ و ڕەبەن بوو. ئەم کابرایە خووی دابووە تلیاك کێشان (لەوێ بە تلیاك و بەنگ و هێرۆیین و کافایین و تاد.. هەر دەوترێ دراگ d r u g و زۆرێك لە گەنج و پیری ئەو وڵاتە پێوەی گرفتارن). هەر کاتێ ڕاندی دراگی پێبوایە ئەوە پیاوێکی هێمن و ڕێکوپێك بوو بەڵام کە لێی دەبڕا دەبوو بە سەگی هار و شەڕی پێدەفرۆشتین و ئەگەر زۆریش سەرمان بکردایەتە سەری بۆڕەبۆڕ دەستی دەکردە گریان، کەچی بە بارێکی تردا بارە خوێت لێبنایە.

لەو سێ شوێنەی کارم تێداکرد، هیچ سەندیکایەکم نەدی بەرگری لە کرێکار بکات لە مەسەلەی کرێ و لە کار دەرکردن و شتی تردا. ئەو خەڵکانەی لەوێ کاریان دەکرد ناوی کرێکاریان لێنەدەنرا و بە کارمەند و مونتەسیب و مووچەخۆر و شتی لەم جۆرە ناودەبران بەڵام یاسای کاریشیان بەسەردا دەسەپی. لە برلنگتن کە زیاد لە ١٥٠ کەس کاری دەکرد دەبوو سەندیکایەك هەبوایە کەچی نەبوو. بەڕێوەبەری بازاڕەکە بە کەیفی خۆی خەڵکی دەهێنا و خەڵکی دەردەکرد و کەس نەیدەتوانی پێی بڵێ لەل، هەروەها بە ئارەزووی خۆی و بە گوێرەی ڕێککەوتن لە گەڵ ئەو کەشەدا کە دادەمەزرا کرێی دادەنا، بۆ نموونە ئێمە ئەو چوار پێنج کەسە لەوێ، لەگەڵ ئەوەشدا کە لە یەك کات و یەك شوێندا کارمان دەکرد بەڵام جیاوازیی هەبوو لە کرێدا. من ٧,٥ دۆلار بووم و تێیاندا هەبوو هەشت دۆلار و هەشبوو حەوت بوو، کەسیش بۆی نەبوو بە ئاشکرا باسی کرێ بکات لە کۆبوونەوەی کاردا. ئەگەریش لەگەڵ خاوەنکار یان بەڕێوەبەر باست بکردایە پێی دەوتی تۆ تازە وارێکەوتوویی لەگەڵمان. ئەڵبەتە هەموو کەس و لە هەر شوێنێك کارێکی باشتری دەست بکەوتایە لەڕووی کرێ و بارودۆخی کارەوە ئەوە بێدوودڵی دەیگواستەوە و کەس ڕێگریی لێنەدەکرد. ئەوانەی بۆ ماوەیەکی زۆر دەمانەوە لە

کارێکدا ئەوە یان کرێکەیان باش بوو یان لەو شوێنە مووچەیان زیادی کردبوو و تازە ئەگەر بچوونایە بۆ شوێنی تر دەبوو لە نووکەوە دەست پێبکەن. سیستەمی کار وابوو کە نابێ کەس کرێی خۆی بەویتر بڵێ و هەر کەسە لە سەرچاوە یان ژمێریاری سەرەکی کارەکەیەوە چەکەکەی بە داخراوی بۆ دێتەوە و نابێ پێشانی کەسی تری بدات بەنکەکەی خۆی نەبێت. بەڵام ئێمە گەلێ جار ئەو مەسەلەیەمان فەرامۆش دەکرد و کرێی خۆمان بە یەکتر دەوت. ئەڵبەتە ئێمە هەفتانە چەکی کرێمان بۆ دەهاتەوە، بەلام بۆ ئیشی حکومەت و ئەو کارانەی ئەهلیش کە پارەی زۆر دەدەن ئەوە مانگانەیە. برادەرە کوردەکان یەکەمجار کە کرێی کارکردنیان ئاسایی بوو هەموو شتێکیان بە یەکتر دەوت بەلام دواتر هی وا هەبوو ئیشی باشی دەست دەکەوت بە ئۆڤەرتایم و شتی لەو جۆرەوە و ڕاستیی پارەی خۆی بە کەس نەدەوت. من پێموایە ئەم نەریتە یەکەمجار سەرمایەدارەکان دایانهێناوە بۆ ئەوەی کەس نەزانێ کرێی ئەویتر چەندە و ئەمانیش بۆیان بلوێ بە ئارەزووی خۆیان خەڵك بچەوسێننەوە. ئێستا ئەو نەریتە لە سەرانسەری ئەمەریکادا باوە و شتێکی زۆر ناشیرینە بە خەڵك بڵێی مووچەت چەندە و بگرە بیشڵێی کارەکەت چیە و لەم ڕووەوە نەریتەکە بە ئیجابی شکاوەتەوە کاتێ بەراورد دەکرێ لەگەڵ نەریتی سەقەتی کۆمەلایەتیی لای خۆماندا کەوا خەڵك لە خۆڕا مافی ئەوە بە خۆی بدات لە هەرکەسێك بپرسێ کەوا کرێ و مەعاشی چەندە. ڕاستێکەی من کە مامۆستا بووم و سەری مانگ مووچەمان وەردەگرت مامۆستای وا هەبوو بە پرسیارەوە نەدەوەستا و دەچوو تەماشای لیستەکەشی دەکرد و پاشان دەیوت فلانە مامۆستا، بۆ نموونە، سەد و بیست دینار و چوارسەد و پەنجا فلس وەردەگرێ!

لەم شوێنەدا باروزرووفی کارکردن بۆ ئێمە خۆشتربوو، بە پێی دەستووری بازاڕەکە دەبوو قات لەبەر بکەین و بۆینباخ ببەستین لە کاتی سەرپەرشتیی بەشەکە و جلی شێواو ڕێکخستندا و بە دەم مەعمیل و کڕیارەکانەوە بزە بخەینە سەر لێو و پێیان بڵێین فەرمانتان بەچیە بۆتانی جێبەجێ بکەین. ئەڵبەتە هەندێ جار ئەگەر ڕاندی لێمان بەلەسە نەبوایە و دراگەکە سڕی بکردایە بۆمان هەبوو دانیشین و دەمەتەقێش بکەین و لەگەڵ کچان و کوڕانی بەشەکانی تریشدا بۆ خۆمان قسەی خۆشیش بکەین. لەڕاستیدا من لەم شوێنەدا هەناسەیەکی باشم دا و لە هەمان کاتیشدا بۆ ئەوەی قسە و سەرنجی خراپم نەیەتە سەر کارەکەی خۆم بە

جوانی ئەنجامدەدا و مایەی ڕەزامەندی و ستایشی بەڕێوەبەرانی بازاڕەکە بووم. لێرە ئەگەر دەستپاك بیت خۆشیاندەوێی چونکە لەو بازاڕانەدا دزییەکی زۆر دەکرێ، چ لە لایەن کڕیارەوە یان لە لایەن کارمەندانی شوێنەکە خۆیەوە، هەرچەندە ئەگەر کارمەندێك شتێکی وای لێ ئاشکرا ببێت ئەوە ئابڕووی دەچێ و لە کارەکەش دەریدەکەن و گەلێ جار تەسلیمی پۆلیسیشی دەکەن و سزاکەشی زۆر قورسە. ئەمە بەسەر کارلۆسی برادەرماندا هات. کارلۆس کوڕێکی سەلاری خەلکی بەرازیل بوو، ئیشی خۆی بە جوانی دەکرد بەلام لەپڕ لە کار دەرکرا چونکە وابزانم شتێکی تورەهاتیشی دزیبوو. ڕاستێکەی لە بازاڕەکانی ئەو ولاتە ئەم دیاردەیە بووەتە دەردێکی بێدەرمان و هەرچی دەکەن و دەکۆشن چاری ناکەن و سالانە بایی ملیۆنان دۆلار دزی لەو جۆرە بازاڕانەدا دەکرێ و هەرچەند دەکەن نە کامێرا و نە سێنسۆر کە ئامێرێکی بچووکە لە جلوبەرگی گرانبەهای چەسپ دەکەن و کەس بۆی لێناکرێتەوە و کاتێ لە دەرگاکە بە نیازی دزی دەیبەنە دەرەوە ئامێرێکی لێیە دەزیرێنێ و دزەکە دەگرن. بەلام دز و دەخەلی قالبووی وا هەن کەرەستەی لێکردنەوەی ئەو سێنسۆرانەیان پێیە یان ئەو شوێنەی جلەکەشی پێوەدەدڕن و دەیدزن و وەك بەرزەکی بانانیش بۆی دەردەچن. ئەو دیاردە ناشیرینە بووە بە خوو و پەیوەندیی بە تێری و برسێتیی ئەو کەسەوە نیە کە دەیکات. بە شێوەیەکی بەرچاویش خەلکی ڕەشپێست و ئەمەریکای لاتین ئەم کارە دەکەن. ئاسیاییەکان و بە تایبەتی ڕەگەزی چاو تەسکەکان بە گشتی پاکن و بە موو سەرپێچی ناکەن.

هەر کەسێك و لە هەر شوێنێکی ئەم دنیایەوە پێدەخاتە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاوە فرەی پێناچێت حەقیقەتێکی تالی بۆ دەردەکەوێ ئەویش ئەوەیە کە خەلکی ئەو ولاتە بە ڕەش و سپی و ڕەنگاوڕەنگیانەوە لەڕادە بەدەر دەبەنگ و بێئاگان لە دنیای دەوروبەری خۆیان و وادەزانن لەم سەر زەوییەدا تەنها ئەمەریکا هەیە و بەس، ئەویتری خەلك و ولاتی پشتی دەریان oversea کە هەر هەموو دواکەوتوو و لەبرسا مردوون و کەس هیچ شتێك نازانێ خۆیان نەبێت و ئەمەریکا بە چەقی گەردوون و سەنتەری دنیا دەزانن، بەوانەشیانەوە کە دانوولەیان لە گەلْ سیستەمی سیاسی و کۆمەلایەتیی ئەو ولاتەدا ناکولێت. پێموایە ئەمە لەو دیاردە مێژوییەوە سەرچاوەی گرتووە کە لە تەمەنی نزیکەی پێنج سەد سالەی ئەو ولاتەوە بەردەوام خەلکی ئەوروپا و شوێنەکانی تری

سەر ئەرز کۆچیان بۆ کردووە و تیایدا ژیانی مامناوەندی و باشیان بۆ خۆیان مسۆگەر کردووە و ڕووی نەداوە کەس لە ئەمەریکاوە بۆ وڵاتانی تر کۆچ بکات. بێگومان هەڵکەوتی جوگرافی و پیت و بەرەکەتی وڵاتەکە و ئەو شارستانیەتەی تیایدا بنیاتنراوە و بەهێزیی باری ئابووری و سیاسی و سەربازیی ئەو ئەقڵییەتەی هێناوەتە کایەوە و لە سەرێکی تریشەوە سیستەمە ئابووری و سیاسییەکەی سەرمایەداری لە پشت دەبەنگکردن و پووچکردنەوەی هزری مرۆڤەوەیە و لەوێ کارێکی کردووە کە بەهای بەرزی ئەو وڵاتە تەنها و تەنها پارە پەیداکردن بێت و ململانێی بێئامانی make money (واتە پارە پەیداکردن) هەموو هەست و نەستەکانی خەڵکی ئەو وڵاتەی بۆ خۆی زەوت کردبێت. مرۆڤ لێرە هەموو ژیانی بووە بەکارکردنی بەردەوام و ڕووبەرێك نەماوەتەوە بۆ پراکتیزە کردنی ژیانی ڕۆحی و هەر ئەوەشی لێدەخوازرێ و کاری بەرنامەڕێژیی بۆ دەکرێت مەخلووقێکی ئاڕاستەکراوی لێدەرچێت و جگە لە مەیك مۆنی هیچی تری مەبەست نەبێت. بۆیە لێرە و لە ماوەی ئەو نزیکەی دوو ساڵەدا من کەسێکی وام نەبینی بخوێنێتەوە یان زانیارییەکی تەنانەت سادەشی هەبێت لە سەر وڵاتانی تری جیهان و بگرە تەنانەت لە سەر ئەمەریکا خۆیشی. دیارە کارم بە سەر ئەوانەوە نیە لە فێرگە و پەیمانگەی تایبەت خوێندوویانە و پسپۆرییان لە بواری وڵاتێك یان کاروبارێکی دیاریکراوی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەو وڵاتە وەرگرتووە و لەو بوارەدا کورد واتەنی تەقلە بە فیل لێدەدەن، بەڵکو مەبەستم خەڵکە ئاساییەکەیە کە بێئاگاییەکەیان یەکجار بێتامە و بە بەراورد بەم وڵاتانەی ئێمە تەنانەت شوانێك یان جووتیارێك هێندەی موتابەعەی ڕادیۆ و بەم ساڵانەی دواییەش تەلەفزیۆن کردووە کە هەر هیچ نەبێ شتێك دەربارەی دنیای دەرەوەی خۆی بزانێ، کەچی ئەمەریکییەك لە بەر لووتی خۆی بەولاوە هیچ نابینێ و نابیستێ و لە هەمووشی تاڵتر ئەوان تەواوی خەڵکی دنیا بە نەزان و نەفام تێدەگەن و ئەگەر بیشخوازیت شتێك زانیاریی خۆتیان بۆ باس بکەیت بواری گوێگرتنیان نیە و بە موجامەلەی بۆش و بەتاڵ بەرێت دەخەن.

کاتێ لە کرۆگەر کاشێر بووم هەفتانە پیاوێکی پیر دەهاتە بەر مێزەکەی من و بووبووین بە ئاشنا، چونکە جارێکیان کە پرسیاری لێکردم خەڵکی کوێم وتم کوردستان، وتی پاکستان؟ وتم نەخێر عێراق ـ بەغدا. بەمە کۆڵێ گەشایەوە و وتی

من سالانێك لە توركیا بووم و لە جەنگی جیهانیی دووەمدا ئەفسەری دەریاوانیی ئەمەریکی بووم لە ئەستەموول و حەوزی تەنگەی بۆسفۆر و باسی سەرکەشیی زەمانی گەنجێتی خۆیی بۆ دەکردم و لە گەڕەکەکانی ئەستەموول و دوورگەکانی بۆسفۆردا و وای بۆ باس دەکردم کە من شارەزای کون بە کونی ئەو شوێنانە بم، کاتێ دەمگووت بابە من دوورم لەو شوێنەوە و هێشتا ئەستەموول و تەنگەی بۆسفۆریشم بەچاو نەدیوە، سەرێکی دەلەقاندو بزەیەك دەیگرت و خواحافیزیی لێدەکردم، بۆ هەفتەی داهاتوو کە دەهاتەوە بە هەمان دەستووری پێشوو باسی تۆپقاپی و فلان جزیرەی بۆسفۆری وا بۆ دەکردم کە من خەڵکی ئەوێ بم و حەوت پشتیشم لەوێ لە دایکبووبێت. منیش ناچار بزەیەك دەیگرتم و وەك لالە حەمەی گەرمیانەکەی لای خۆمان تەماشایەکم دەکرد و دەموت هاها، هاها!

# خەڵکی کوێی؟ کوردستان.. ئیٚ ئیٚ تیٚگەیشتم پاکستان

هەر ئەفسەرە پیرە خانەنشینەکەی مارینز ئەو وەڵامەی سەرەوەی نەدەدامەوە، بەڵکو گەڵێ کەسی خەڵکی ئەم وڵاتە کە بۆ موجامەلە و دۆستایەتی پرسیاریان لێدەکردم بە ڕەچەڵەك خەڵکی کوێم و کاتێ دەموت کوردستان تەقەی سەریان دەهات لەم وشەیە و هەرە ئاقڵەکەیان یەکسەر لە مێشکی خۆیدا دەیبەستەوە بە هندستان و پاکستانەوە. تاکوتەرایەکیان ناوی عێراقیان بیستبوو لە سۆنگەی جەنگی هەشت ساڵەی ئێران - عێراقەوە و بۆ ئێمە لە دوو سەرەوە خۆش نەبوو بڵێین خەڵکی عێراقین، یەکەمیان لەبەر ئەوەی وەك کورد هێندە ستەم و دەردەسەریمان بە دەست ئەم دەوڵەتە بنەما ئیفلیج و شۆڤێنیەوە چەشتبوو کەوا هیچ مایەی شکۆ و شانازی نەبوو بڵێین خەڵکی ئەو وڵاتەین و خۆشمان ڕەهەندەی دەستی ئەو ڕژێمە خوێنمژە بووین. دووەم و بۆ نەگبەتیی ئێمە گەڵێ لە ڕەشپێستەکانی ئەو وڵاتە مەیلیان بەلای عێراق و سەدام حوسێنەوە بوو نەك لەبەر خۆشەویستیی ئەو بەڵکو لەبەرئەوەی ڕقیان لە ئەمەریکا بوو. لەمەدا ناهەقیان نەبوو چونکە لە مێژوویاندا ئەوەندەیان زوڵم و ستەمی سپیپێستەکان چەشتبوو لە باسکردن نایەت و ئەگەرچی ئێستا بە پێی یاسای ئەو وڵاتە جیاوازیی لە نێوان کەسدا ناکرێت بە هۆی نەتەوە و ڕەگەز و ڕەنگ و ئاین و.. تاد. بەڵام لەواقیعدا لە ناخی هەردوو لادا ئاسەوارێك هەر ماوەتەوە و دڵیان لە ڕاستی یەکتر هەر پاك نەبووەتەوە. بۆ نموونە بۆ فۆرمی کارێك تا تەلەفۆن بۆ ڕەشپێستێك دەکەن پەنجا ڤێتنامی و چینی و هندی و کوێ و کوێ دەخرانە سەر کار و ئەوانیش لە داخی دڵی خۆیان و کاردانەوە بۆ ئەو جۆرە ڕەفتارەی دەرهەقیان دەکرێ پەنا دەبەنە بەر دزی و توندوتیژی و ساختەچێتی لە هەڵسوکەوتیاندا. بە پێچەوانەوە ئەو ڕەشپێستانەی تازە لە وڵاتەکانی ئەفریقاوە دەهاتن خەڵکی بەئەدەب و لەسەرخۆ بوون و لە کار و کرداریشیاندا ڕاستگۆ و ڕێکوپێك بوون.

جارێکیان ئەمەریکییەك لێی پرسیم خەڵکی کوێی، لە دڵی خۆمدا وتم ئەگەر بڵێم کوردستان هەر نەیبیستووە، ناچار وتم عێراق و وتی: ناوی وام نەبیستووە و

وتم ئەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستت بیستووە وتی نەخێر، وتم بابە خەڵکی کیشوەری ئاسیام وادیاربوو بە تەمومژێك ئاسیای بیستبوو. جارێکی تر هەمان پرسیارم لێکرایەوە و ئەمجارەیان وتم کوردستان و وتی کوردستان چیە منیش بە تەوسەوە وتم کوردستان ویلایەتێکی ئەمەریکایە لە نزیك ویلایەتی کۆلۆرادۆوە لە ڕۆژئاوا و ئێمە لە جۆرجیا بووین لە باشووری ڕۆژهەلات، بڕواتان بێ بە تەواوی بڕوای کرد و بەلایەوە سەیر بوو چۆن تا ئێستا ناوی ئەم ویلایەتەی ولاتەکەی خۆیانی نەبیستووە. کەچی جارێکیان کچێکی گەنجی خەڵکی چیلی لە ئەمەریکای باشوور ئەو پرسیارەی لێکردم و کاتێ وتم: کوردستان وتی کام بەشیان عێراق، ئێران، تورکیا. ئەمەم زۆر بەلاوە سەیر بوو بەلام دوایی بۆم دەرکەوت ئایریس، کە ناوی کچەکەیە و، زۆرێك لە خەڵکی ولاتەکانی ئەمەریکای لاتین، ئێمە ئاسا ئاگاداری گەلێ کەین و بەینی سیاسی و کۆمەلایەتیی ولاتانی دنیان و بەشی خۆیان زانیارییان هەیە لە سەر مەسەلە هەلایساوەکانی جیهان، کەچی زۆرێك لە ئەمەریکییەکان تەنانەت بە ناوی چیاکانی ڕۆکی و ئەپەلاشیاش ئاشنا نەبوون کە دوو بڕبڕە چیای گەورەی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوای ئەو ولاتەن و قوتابیانی لای خۆمان لە قۆناخی ناوەندیدا دەیخوێنن.

بەهەرحاڵ با بگەڕێمەوە بۆ بازاڕی برلنگتن و ئەو کارەی کوردێك و ڕووسێك و ڕۆمانییەك و کۆرییەك و ڕەشپێستێکی ئەمەریکی – ئەفریقی بە یەکەوە کۆکردبۆوە. سیانەکەی یەکەممان هەمان بۆچوونمان هەبوو لە سەر کالفامیی خەڵکی ئەم ولاتە. ئەلێکس و پۆڵ، کە لەڕاستیدا ناوی پافل بوو، گەلێ جار پێکەوە بە ڕووسی قسەیان دەکرد بەلام لای هاوکارە ئەمەریکاییەکانماندا هەر بە ئینگلیزی دەدوان. ئێمە فرەجار لە هەلسوکەوتی ڕاندییەوە تەماشای هەموو ئەمەریکییەکمان دەکرد. ئەم کابرایە هێند دەبەنگ بوو جارجار لەگەڵ من بە ئیسپانی قسەی دەکرد و ئەوەندە ئەقلی بەوەدا نەدەشکا کەوا لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا کەس بە ئیسپانی نادوێ. گەلێ جاریش زۆر بلحانە پێی دەوتم محەمەد تۆ یەکشەممان دەچی بۆ کەنیسە؟ لەولاوە ئەلێکس و پۆل دەستیان دەکردە پێکەنین و دەیانوت بابە ئەو ناوی محەمەدە و موسلمانە و کەنیسەی چی، هیچ نەبێ بلێ مزگەوت!

ئەلێکس کوڕێکی گەنج و قۆزی خەڵکی ڕۆمانیا بوو، لە سەردەمی چاوچیسکۆدا باوکی یەکێك بووە لە دەسەڵاتدارە دەوڵەمەندەکانی شاری بوخارێست و کارگەیەکی جینز(کاوبۆی) هەبووە لەو وڵاتەدا و بەرتیلی تەنانەت بە خودی چاوچیسکۆش داوە بۆ ئەوەی کاری بازرگانیی مەیسەر بێت. لە سەردەمی هەرەسهێنانی ڕژێمە بەناو سۆشیالیستەکەی ئەو وڵاتە و لەناوچوونی چاوچیسکۆی دکتاتۆردا ئەمیش هەڵاتووە بۆ ئەمەریکا. ڕۆژێکیان ڕاندی و چەند کارمەندێکی بازاڕەکە لە ئەلێکسیان پرسیبوو لە وڵاتی ئێوە ئۆتۆمبیل هەیە؟ ئەویش لەوەڵامدا وتبووی نەخێر هەرگیز ئۆتۆمبیلمان نەدیوە و لە بوخارێستدا هەر بە کەر و هێستر هاتوچۆ دەکەین!

لەو بازاڕەدا بۆ ماوەیەکی کورت دوو کچی پاکستانی جوان و ڕۆحسووك، کە ناویان ئایشە و زەرلەش بوو، بوون بە هاوڕێم و هەردوکیان شیعە مەزهەب بوون و زۆریان پێخۆشبوو من لە وڵاتێکەوە هاتووم کەربەلا و نەجەفی تێدایە. ئەمانە دوو کچی ڕەوشت بەرزی نەریتپارێز بوون و ئایشەیان سەرپۆشێکی تەنکی بە سەرەوە بوو و خۆی زۆر جوان بوو سەرپۆشەکەشی هێندەی تر جوانی کردبوو. زۆری پێنەچوو هێندەمان زانی ئایشە دیارنەما و کاتێ پرسیارم کرد وتیان کارلۆسی بەرازیلی بێزاری کردووە و ئەویش لەداخا کویتی کردووە، واتە وازی لە کارەکەی هێناوە. ئەم بەزمە لەم وڵاتەدا بێزارکردنی سێکسی sexual harassment پێدەڵێن و سزای یاسایی لە سەرە، ئیتر توانج و پلار بێت یان ڕێگە پێگرتن و دەسدرێژی کردنە سەر بێت یان هەرچییەکی تر. ئەم وڵاتە بەردەوام هێند کۆچبەری چاوبرسیی بۆ دێت کە پاش مەرحەبایەك هەموو شتێك لە کچێك دەخوازن و ناشیانە کارەکەیان دەچێتە خانەی بێزارکردنەوە و تووشی سزا دەبن لە سەری.

پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانی کارمەندانی ئەم بازاڕە زۆر باش بوو.. من بێجگە لەو دوو سێ برادەرەی پێشتر باسم کردن دۆستایەتییەکی پتەوم هەبوو لەگەڵ دوو ژنی هاوکارمدا، یەکەمیان ناوی لیزا بوو، کە ژنێکی سوعبەتچی و قسە خۆشی ڕەشپێست بوو، لیزاش وەك من چوار منداڵی هەبوو و دەبوو ئەویش ڕۆژانە

١٣ – ١٤ سەعات کار بکات بۆ ئەوەی بتوانێ منداڵەکانی بەخێوبکات و من لە حاڵەتی لیزاوە بەچاوی خۆم هەژاری و قوڕبەسەریی هەندێ خەڵکی ئەو ولاتەم بینی. لیزا هەر رایدەکرد و هیچی بە هیچ نەدەبوو. مێردەکەی کابرایەکی ڕەشپێستی تلیاك کێش بوو ئۆتۆمبیل و خانووەکەیانی فرۆشتبوو و لیزا و چوار منداڵەکەی بەجێهێشتبوو. هەموو جارێ ئەم ژنە دنیایەك خەمی بۆ من هەڵدەڕشت و نەیدەزانی چیبکات و منداڵەکانیشی هیچیان لە تەمەنی کارکردندا نەبوون. سەرباری ژیانی پڕ لە ڕەنج و غوربەتی خۆم خەفەتێکی زۆریشم بۆ ئەو دەخوارد. ڕۆژێکیان لیزام بە ڕوویەکی خۆش و گەشەوە بینی و ویستم پرسیاری لێبکەم بەلاَم نەیهێشت گفت هەڵبێنمەوە و وتی محەمەد حەز دەکەم نهێنییەکم هەیە پێت بڵێم. فەرموو لیزا یاخوا خێر بێت. وتی لەم ماوەیەدا پیاوێکی ڕەشپێست بووە بە هاوڕێم و شەوان لام دەمێنێتەوە و ئێستا دەیەوێ بمخوازێ تۆ دەڵێی چی؟ منیش پێموت ساوەڵلاّ هەزاری خێرە و دووی بەرەکەت، هیچ دوودڵ مەبە و شووی پێبکە. جا هەرواشی کرد و پێموایە کارێکی زۆر چاکی کرد. ژنە هاوکاری دووەمم سپیپێستێکی ناسك و زۆر جوان و ناوی تێمی بوو، تەمەنی نزیکەی ٣٥ ساڵ دەبوو. تێمی لە بەری دوو مێرد سێ منداڵی کۆکردبۆوە و لە هەردوکیشیان تەلاّقی خۆی وەرگرتبوو. کچە بچووکەکەی لەگەڵ کچەکەی مندا لە یەك مەکتەبدا و لە پۆلی سێی سەرەتاییدا بوو. جارێکیشیان پێکەوە چووین بۆ مەکتەبی منداڵەکانمان و ئەم هاومەکتەبییە پەیوەندییەکی ڕۆحیی بۆ دروستکردبووین. ژنی ئەمەریکی زۆر شانازی بە مێردەوە دەکەن و کە دەڵێن مێردەکەم m y husband دەڵێی باسی گەزۆ و حەلْوا دەکەن هێند بە دەمیان خۆشە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا کەمیان هەیە جارێك و دوان لە ژیانی هاوسەریدا تەلاّق نەدرێت. ڕۆژێکیان بە تێمیم وت باشە بۆچی تۆ دوو جار تەلاّق دراویت و ئەم سێ منداڵەشت دروستکردووە. زۆر ڕاستگۆیانە پێی وتم مێردی یەکەمم زۆری دەخواردەوە و ئیشنەکەر بوو دووەمیشم بەنگکێش بوو و لەگەڵیدا هەڵمنەدەکرد، ئەوجا لە ولاّتی ئێمەشدا تەلاّق وەرگرتن ئاسانە و سێکس کردنیش هەر ئاسانە، ئیتر بۆچی خۆم بە بەلاّیەکەوە ببەستمەوە. ئەم سەراحەتەی تێمیم بەلاوە جوان بوو و بە سوعبەتەوە پێموت بەتەما نەبیت

ببمە مێردی سێهەمت، مـن مـاڵ و منداڵی خۆم هەیـە و ڕێزیـان دەگـرم. لێرەدا وەك هـەر ژنێکـی لای خۆمـان سـوور هەلگــەڕا و دەســتێکی کێشــا بــە پشــتمدا و بــە پێکەنینەوە وتی ئۆی محەمەد!

هەر لەم بازاڕەدا کیژۆڵەیەکی سپیپێستی سەلار و ناسك کە نـاوی ئەلیسۆن هـەی Alison Hay بوو، دۆستایەتی دەکردم و هەرچەندە لە بەشی وردەواڵە Ac cessory کاری دەکـرد بـەڵام ڕۆژانـە دەهات بـۆ لام. ئەلیسـۆن کـەم ئـەندام بـوو و هەرچـەندە گـەنج و منـداڵ بـوو بـەڵام پشـتی کـەمێك چـەمابۆوە و کـووڕ بـوو. ئـەم کچـە زۆر تێکـەڵی کچـانی تـر نـەدەبوو بـەڵکو دڵـی بـە مـن دەکرایـەوە و منیـش زۆر ڕێـزم لێدەگرت و وەك کەسێکی تەندروسـت و ساغ مامەڵەم لە گـەڵ دەکـرد و ئـەویش زۆر باش هەستی دەکـرد دڵـی ڕادەگـرم و نەمدەویست چەشـنی ژنـە کـامڵ و هاوکارەکـانی تـرم پرسـیاری ژیـانی تایبـەتی لێبکـەم. پێموایـە ئەلیسۆنیش وەك چـەندین منـداڵ و گـەنجی ئـەو وڵاتــە بێبـاوك بووبێـت و لــە نەسـتیدا وێنــەی بــاوکێکی لــە منــدا دۆزیبێتەوە.

من لەم کـارە سـەرەکییەمدا مـانگی هـەزار و سـەد دۆلارم دەسـتدەکەوت و هەفتانـە چەکەکـەم سـپاردەی بـەنك دەکـرد. لێرەدا ڕەنگـە خوێنــەر بڵــێ نامــەخوا پارەیــەکی مۆڵی پاشــەکەوت کـردووە. ئـەوی ڕاسـت بێـت ئـەوە پارەیـەکی مـۆڵ بـوو ئەگـەر کـرێ خانوو و خزمـەتگوزاری ئـەو کـارەی پێنەکردمایـە کـە کـردی. چونکـە مانگانـە دەبـوو چەکێك بنووسم بە بڕی ٦٨٥ دۆلار بۆ کـرێ شـوقە و دەبـوو لـە سـەرەتای مانگـەوە تـا پێنجی مـانگ چەکی کرێکەم تەسلیم بکردایـە دەنـا بکەوتایەتـە شەشـی مـانگ دەبـوو ١٠٪ زیاتر بدەم و هیـچ لاموجیمێکـی تێـدا نـەبوو. هـەروەها بـە چـەك بـڕی ١٠٥ دۆلار کارەبـا و ٦٠ دۆلار گـاز و ١٠٠ دۆلار ئـاو (بــە هاوینــان) و ١٥ دۆلار تەلــەفزیۆن و ١٣٠ دۆلار تەلـەفۆنی نێـوان ویلایەتــەکان. کـەوابوو بـڕە پارەکـە کـردی ١٠٩٥ دۆلار و لـە ڕەنجی مانگێکی ئەو بازاڕەم تەنها پێنج دۆلارم بۆ دەمایەوە. واتـە پـارەی کرێکـەم بـە چــەك لــە بــانك دادەنــا و هــەر بــە چــەکیش دەمدایــەوە بــە کــرێ خــانوو و خزمـەتگوزاریدا، واتـە لـەم بەینـەدا تەنـها کاغـەزم بـە کاغـەز دەگـۆڕییـەوە و گوایـە ئیشەکەشـم خـراپ نیـە و گـەلێ ئەمـەریکیش مونافەسـەیان لەگـەڵ دەکـردم بـۆ ئـەو

ئیشە باشە. مایەوە ئەو ٣ – ٤ سەعاتەی کە لە مارشاڵ کارم دەکرد لەگەڵ ڕۆژانە ٣ – ٤ سەعاتێکی تری خێزانمدا کە هەفتانە بە هەردوکمان ٢٥٠ دۆلارێکمان بۆ دەمایەوە بۆ خواردن و جلوبەرگ و خەرج و مەسرەفی چوار منداڵ یان خێزانێکی شەش کەسی.

# سەردانێك بۆ كەناڵی CNN و باسێك لە ڕاگەیاندنی ئاڕاستە

سێنترالیزەکردنی ڕاگەیاندن ڕەگێکی قووڵی هەیە لەم جۆرە وڵاتانەی خۆماندا و سەرچاوەکەشی لە سێنترالیزەکردنی دەسەڵات و سەپاندنی گوتارو بۆچوونی دەسەڵاتەوەیە بە سەر"ڕەعییەتدا"، هەر لە ناوهێنان و پەسن و ستایشی خەلیفە و سوڵتانەوە بگرە لە نوێژی جومعەدا، تا دەگاتە گوزارشت لە بیر و ئایدیای تاکحیزبی دەسەڵاتدار و ئایدیۆلۆجیای دۆگما و نەتەوەپەرستی شۆڤێنیست لە چەرخی نوێدا. لە هەموو حاڵەتەکانیشدا خەڵك و جەماوەر هەر ڕەعییەتەکەی جارانن و دەسەڵات بیروبۆچوونی خۆی بە سەریاندا دەسەپێنێت و هەردەم سەرچاوەکەشی تاکڕەوی و خودسەری و ئەقڵییەتی (نەخێر) قوبووڵ نەکردن و سەرەنجام چەوساندنەوەی خەڵکە.

لێرە، لەم جۆرە وڵاتانەی خۆماندا، ڕاگەیاندنی ئاڕاستەکراو بووە بە میراتێك و بە فەرهەنگێکی ئەوتۆ کە دەربازبوون لە جوغز و بازنەکەی جۆرە نامۆییەك بەخۆوە دەبینێت. تەنانەت لە ناخ و نەستی ئەوانەشدا کە پرکێشی بەزاندنی سنووری ئەو بازنەیە دەکەن، یان بانگەشەی دیموکراتیزەکردنی کۆمەڵگا و لیبرالیزەکردنی ڕاوبۆچوون و ڕاگەیاندن دەکەن. ئەوانە تاکە کەس بن، گرووپ بن، حیزب بن، هێندە لەگەڵ ئەو جاڕدان و کۆششەدان کە زیانی بۆ خۆیان نەبێت، بە پێچەوانەوە پێی دەمارگرژ دەبن و گەر نەبێ بە "لۆمە" لە سنوورێکدا پەکیشی دەخەن و هەندێ جار لێیشی پەشیمان دەبنەوە و دەگەڕێنەوە سەر نەریتی چەسپاوی ئاڕاستەکاری و کاریگەریی گورز و کوتەکی ئەو ڕاگەیاندنە بە لۆجیکی"لە بەهەشتەوە هاتنی ئەو کوتەکە".

ئەڵبەتە کاری دەربازبوون لە میراتێکی وا قورس ئاسان نیە و کاری ڕۆژ و دوو ڕۆژیش نیە، بەڵکو پرۆسەیەکی ئاڵۆز و درێژخایەن دەبێت و قۆرت و نووچدانی زۆریشی دێتەڕێ. بێگومان ئازادیی ڕاگەیاندن بەستراوە بە گەلێ بوار و چەمکی تەواوکردووی یەکترەوە. لاموایە هەرگیز ئەو ئازادییە مەبەستی خۆی ناپێکێت، ئەگەر ڕەچاوی مافی مرۆڤ بەگشتی و مافی تاکەکەس لە کۆمەڵدا نەکات و سەرجەم ئەوانە نەبەستێ بە چەمکی ئاسایشی نیشتمانی و پاشخانی مێژوویی، کۆمەڵایەتی، ئابووری، دەروونی..تاد وڵاتو کۆمەڵگاوە، کە مامەڵەکردن لەگەڵ هەر یەك لەمانە کۆمەڵێك مشتومڕ و بێنەوبەرە دێنێتە پێشەوە.

ڕاسته کۆمەڵگای ڕۆژئـاوایی دەمێکـه ئـەو سەربەستییه پیاده دەکات و ئێستا بـووه بـه فەرهـەنگێك، لادان و لێترازانی کـارێکی نەشـازه و ئێمـەش دەخوازیـن و خواسـتێکی زۆر ڕەواشه لایەنی درەوشاوەی ئەزموونی ئەوان پیاده بکەین و بگره گەشەیشی پێبدەین، بەڵام عەرەب واتەنی"العین بصیرة و الید قصـیرة" و وا بـه زوویـی نـاتوانین دەردەستی بکـەین و دەبێ لەگـەڵ پرۆسەکەدا بــه شـێنەیی بڕۆیــن و کۆڵیشـی لێنــەدەین و ئــەو ڕاسـتییەش بیرنەکەینَ که ڕێگای هەزار میل به هەنگاوێك دەست پێدەکات، ئەگەرچی گـەلێ هـەنگاویش نـراوه.

پیاو دەخوازێت له ڕاگەیاندندا دەنگ و ڕەنگـی جۆراوجۆر زۆر بێـت، بـەڵام بـەخوا قەت "ئەم حەشری نێرەکەرەی" ئیعلامی ئێستای عـێراق دەنـگ و ڕەنـگ نیـه و زۆر سـەیر ئاشـی چەواشـەکاری و درۆ و دەلەسـه لـه گەڕدایـه و مــرۆڤ هـەندێ جـار لــه ڕووی تەوســەوه هــەر زەبروزەنگەکــەی ســەدامیان پــێ قــابیل دەبینــێ، هەرچــەنده ئەمـەش هـەر فەهەنگەکـەی بەعسـه و دیـاردەی هەلپەرسـتی هــەروا زوو ڕیشـەکێش ناکرێت.

ئێمه که بەرەو ڕاگەیاندنی ئازاد دەچین نـابێت بـەهیچ کلۆجێ ئـەو ڕاستیه فـەرامۆش بکـەین کـه دەبێـت کـادری ڕۆشـنبیر و شـارەزا و خوێنـدەوار پێبگەیـەنین. تـۆ بڕوانــه ئــەو هـەموو خـەوش و هەڵەیـەی لـه ڕۆژنامـەکانماندا بەرچاودەکـەون، تـۆ بڕوانـه ئــەو هــەموو سەقەتییەی له زمانی کوردیدا دەکرێت، هـەر لـه تایپێسـتێکی کۆمپیوتـەرەوه بگره تـا ئـەو بەناو شارەزایەی گەلێ سەقەتی و خەوشی به سەردا تێدەپەڕێت، تا ئەو فەریکه کیژۆڵەیەی له ڕادیۆیەکی ناوخۆی ئەم شارەدا بـه هـەزار حـاڵ و بـه حینجه نـاوی گونـد یـان شـاخێکی وڵاتەکەی خۆی پێدەخوێنرێتەوه. من پێمخۆشه ڕۆژنامــه و گۆڤـار و ڕادیـۆ و تریبیـۆنـەکان زۆربـن، بـەڵام کـه بـۆر بـوون کارەسـات ڕوودەدات و هیـچ پـەیامێك ناگەیــەنن و"مــیزاجی کوردەواریشــمان" تێکــدەدەن. ئــاخر خــۆ وەنــەبێت گلۆبــاڵیزم هــــەر چەپکــــه گوڵی"معلوماتی"مان بۆ بێنێـت، چونکـه گـەر ئاگامـان لـەخۆ نـەبێت گـەلێ دەردی دیکەشـی لەگەڵدایـه. گلۆبـاڵیزم فرەجـار سڕکردن و چەواشـەکاری و چاوبەسـتیکردنی ڕۆشنبیریشـی لەگەڵدایـه تـا ڕادەی نـەخوێندەوارکردنی خـەڵك. گلۆبــاڵیزم لای ئێمــه تەنـها لـه ئـامێری سەتەلایت و کەم تا کورتێکیش ئینتەرنێتدا خۆی کـردووه بـه ناومـاندا، کـەچی ڕێژەیـەکی زۆری خـەڵکی لـه خوێندنـەوه دابڕیـوه و مێشکی سـەدان لاویشـی بـه سایته سێکسـییەکان گوشیوه.

له ساڵی ٢٠٠٠دا كه زنجیره‌یه‌ك بوومه‌له‌رزه‌ی، خۆشبه‌ختانه سووك، دای له سلێمانی، فه‌نده‌مێنتالیسته‌كان ده‌یانوت: چۆن خوا غه‌زه‌ب له‌م شاره ناگرێت كه ئه‌وه‌نده ژنی سه‌ر رووت و قۆڵ رووتی تێدایه. لێره‌دا ڕه‌نگه گه‌لێكمان له دیارده‌ی نارێكی به‌كارهێنانی گلۆبالیزمدا ده‌ق له‌گه‌ڵ بۆچوونی ئه‌و فه‌نده‌مێتالیستانه‌دا یه‌كبگرنه‌وه كه چه‌ند به سه‌لبی كاری كردووه‌ته سه‌ر رووكه‌شكردن و نه‌خوێنده‌واركردنی توێژێكی به‌رچاوی لاوان، كه‌وا ئومێدی دوارۆژی گه‌شی ولاتمانیان لێده‌كه‌ین. من ده‌خوازم تا سه‌ر ئێسقان سوود له‌م ته‌كنۆلۆجیا ناوازه‌یه‌ی ئه‌مه‌ریكا و ڕۆژئاوا ببینین، به‌ڵام له هه‌مان كاتیشدا به وریاییه‌وه، چونكه ئێمه خاوه‌نی گه‌لێ نه‌ریتی باشین و پیاو تا دوور نه‌كه‌وێته‌وه و غوربه‌تی دووره‌ولاتیی تووش نه‌بێت نازانێت كۆمه‌ڵگاكه‌ی خۆی، سه‌ره‌ڕای چه‌ندین ناته‌واوی و كه‌موكووڕیش، چه‌ند به‌های به‌رزی تێدایه. خه‌ڵك لای ئێمه زۆرباشن، وه‌لێ ئه‌وه‌ی كه دیارده و ڕه‌فتاری ناشیرین ده‌خوڵقێنێ هه‌میشه ده‌سه‌ڵاتی ملهوڕ و دوور له خه‌ڵك و به‌های باشی خه‌ڵكه. هه‌میشه لای ئێمه ده‌سه‌لات، بازنه‌یه‌ك هه‌ڵپه‌رست و كاسه‌لێسی به ده‌وری خۆیدا دروستكردووه و هیچ كاتێكیش ده‌ستوور و یاسایه‌ك نه‌بووه به‌و بازنه‌یه بڵێ له‌ل، چونكه یاسا هه‌رده‌م، وه‌ك سه‌دام حوسێن ده‌یوت، لاستیك بووه و به كه‌یفی ده‌سه‌لات ڕاكێشراوه یان كورتكراوه‌ته‌وه.

كه‌واته له ژێر ركێفی ئه‌م جۆره ده‌سه‌ڵاته‌دا هیچ كاتێك ده‌سه‌ڵاتی چواره‌مێك دروست نه‌بووه پێگه‌ی تاكڕه‌وی و سته‌م بله‌قێنێ. هه‌موو كاتێكیش میدیا و ڕاگه‌یاندنی ئاراسته‌كراو له به‌رژه‌وه‌ندیی ده‌سه‌ڵاتی چه‌وسێنه‌ر و دوور له خه‌ڵكدا كاری كردووه. ئا لێره‌وه‌یه كه خه‌ڵك ده‌خوازێت له سه‌نتراڵیزه‌ی ده‌سه‌ڵات و په‌لوپۆكانی ڕزگاری بێت به میدیاشه‌وه. مه‌ركه‌ز ئه‌وه‌نده درێوه لای خه‌ڵك ته‌نانه‌ت ڕاستیش بڵێ، كه قه‌ت نه‌یگوتووه، هه‌ر به درۆ له قه‌ڵه‌م ده‌درێت. له‌به‌ر ئه‌وه به شێنه‌یی كاركردن بۆ چه‌سپاندنی نه‌ریتێكی نوێ ئه‌ركی پیرۆزی خه‌ڵك و ڕۆشنبیری ئاسۆ فراوانه. چیتر كه‌س بایه‌خ به ڕۆژنامه و ڕادیۆ و ته‌له‌فزیۆنی ناوه‌ندی ده‌سه‌ڵات نادات، مه‌گه‌ر ئه‌و ده‌سه‌ڵاته به‌ڕاستی هه‌ڵقوڵاوی ڕای خه‌ڵك بێت و بتوانێت به هۆی ده‌زگا جۆراوجۆره‌كانی ڕاده‌ربڕینه‌وه چه‌وتییه‌كانی ڕاست بكاته‌وه و ئه‌گه‌ر نا بیهێنێته له‌رزه و ملی پێ كه‌چ بكات.

له ساڵی ١٩٩٦ به دواوه ماوه‌ی دوو ساڵێكم له ویلایه‌ته یه‌كگرتووه‌كانی ئه‌مه‌ریكا به‌سه‌ربرد و له‌و ماوه‌یه‌دا به چاوی "مشته‌ری" ده‌مڕوانییه هه‌موو دیارده‌كانی كه به من

نامۆ بوون. ئەوەی زۆر سەرنجی ڕاکێشام ڕۆژنامە و میدیا بوو. منێکی ڕاهاتوو بەوەی ڕۆژنامەکانی ولاتی خۆم هی حکومەت یان هی حیزب بن و هەواڵی کار و کردەوەکانی سەرۆکی حیزب و حکومەت بە مانشێتی گەورە و لە لاپەڕە یەکەمدا بلاوببنەوە و گەلێ جار بە وێنەی گەورەشیانەوە. لەوێ ئەمەم نەبینی، بەڵکو هەر ڕۆژنامەکە خۆیشی سەرلەبەر هی حیزب و دەوڵەت نەبوو. من لە ولاتی ڕۆژنامەی هەشت لاپەڕە یان ئەوپەڕەکەی دوانزە لاپەڕەوە چوومە ولاتێك هیچ ڕۆژنامەیەکی لە هەشتا لاپەڕە کەمتر نەبوو. تەنانەت نیویورك تایمز New York Times ٢٥٠ لاپەڕە بوو، لە جیاتی پیاهەڵدان بە شان و باڵی سەرۆکی ولاتدا، باس هەر باسی داشۆرینی کلینتۆن و مۆنیکای دۆستی بوو. قسەی وایان پێدەگوت، نەك سەرۆکی حیزب و حکومەت لای ئێمە، بەڵکو بۆرە پیاوێکیش قوبووڵی نەدەکرد!

ئەو ماوەیە من لە گەورەشاری ئەتڵەنتا بووم و بنکەی سەرەکیی تەلەفزیۆنی بەناوبانگی CNN لەو شارە بوو. بیناکەی لە ناوجەرگەی شاردا بوو کە لەوێ down townی پێدەڵێن و بۆ خۆی شوێنێکی گەشتوگوزاریی خۆش بوو و پێکهاتبوو لە هەشت نۆ نهۆمێك و هەموو کەس ئازاد بوو پیاسەی تێدا بکات و لە پشتی دیواری شووشەبەندی ئەستوورەوە کارمەندەکانی ببینێ کە لەبەردەمی کۆمپیوتەرەکانیاندا سەرقاڵی کاری خۆیان بوون. قاتی خوارەوەی ساختمانەکە چەند کافیتریا و چێشتخانەیەکی تێدابوو، لە ناوەڕاستیشدا دەیان کامێرا و پرۆجێکتۆر چەسپ کرابوون و هەفتەی جارێك دەکرا خەڵکێك کۆببنەوە و لە سەر بابەتێك گفتوگۆ بکەن و لەو کەناڵەوە ڕاستەوخۆ پەخش دەکرا. شیاوی وتنە ئەم تەلەفزیۆنە ئەهلییە و ساڵی ١٩٨٠ تێد تێرنەر Ted Turner لە شاری ئەتڵەنتا دایمەزراند و بە سیستەمی کێبڵ لە ناو ئەمەریکادا پەخش دەکات و ناوی تەواوی بە ئینگلیزییەکەی Cable Network News.

ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام ئەوە بوو CNN یەك جۆر هەواڵی بۆ سەرانسەری دنیا پەخش نەدەکرد، بەڵکو بۆ ئەورووپا جۆرێك و ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و ئاسیای ڕۆژهەلات و ئەمەریکای لاتین و ویلایەتە یەکگرتووەکان هەر زۆنە و شێوازێکی جیای هەبوو و بە پێی ویست و چەژ و میزاجی خەڵك بوو. ئەو بەرنامانەی CNN کە من لە ولاتی خۆمان و ئاسیای ڕۆژهەلات لە دوورگەی گوام و ناو ئەمەریکا خۆی و پاشانیش لە ئەورووپا بینیم، گەلێ جیاوازییان هەبوو لە گرنگیدان بە شێواز و دارشتنی هەواڵەکاندا. بۆ لای خۆمان کە هەموومان کوشتەی ورد و درشتی هەواڵی سیاسین ئەوەمان بە زیادەوە بۆ پەخش دەکرا.

پێدەچوو میزاجی خەڵك ئەوەی بخوازێت و بۆ زانیاریش CNN کەناڵێکی سەربەستی ناحکومی بوو، خۆ ناشزانرێ ئەو داوانەی دەیبەستنەوە بە سیاسەتی ئەمریکییەوە چۆن چۆنین؟ هەر لە ئەتڵەنتا بنکەی تەلەفزیۆنێکی دیکە هەبوو ناوی FOX بوو، بە نۆرە ژن و پیاوێك گەلێ لە بەرنامەکانیان پێشکەش دەکرد و هێند لای خەڵك ئاشنابوون لە جیاتی نووسینی ناوی وێستگەی تەلەفزیۆنەکە لەسەر بیناکە، دوو وێنەی زۆر گەورەی ئەوانیان لە سەر چەسپ کردبوو و ئەو دوانە بووبوون بە مۆرك و درۆشمی ئەو تەلەفزیۆنە.

لەو شارەدا چەندین وێستگەی ناوخۆی ڕادیۆ هەبوون بە شەپۆلی AM و FM کاریان دەکرد، جارجار گوێم لێدەگرتن و بەرنامەی خۆش خۆشیان بلاودەکردەوە، بەلام هیچیان "گۆرانیی داواکراویان" پەخش نەدەکرد! ڕادیۆیەکی تایبەت هەبوو بە هاتوچۆی ناوشار و زۆر کەس کە لە ئۆتۆمبیلدا دەبوون، لە نێو شەقامە پانوپۆڕەکانی ئەتڵەنتادا هەنگاو بە هەنگاو هەواڵ و بارودۆخی جادەکانیان دەبیست. شەقامی ژمارە ئەوەندە قەرەباڵغە و خۆتانی لێمەدەن، لە فلان شەقام ڕووداوێکی ئۆتۆمبیل بەرپابووە و لە فلان جادەوە باشترە. شەقامی ژمارە ئەوەندەی فڕۆکەخانەی هارتسفیلد ئۆتۆمبیلی زۆری پێوەیە لەویتریانەوە بڕۆ، ئەگەر کەسێکت لەگەڵدایە کاتی سەفەرکردن و هەڵسانی فڕۆکەکەی نزیکە.. تاد.

لەوێ ڕادیۆی AM و FM لە نرخی تۆڵەکەدایە، بەلام ڕادیۆی شەپۆلی کورت Short Wave زۆر گرانە و دەتوانم بڵێم مەسرەفی سولحێکی عەشایەریی ڕووداوێکی هاتوچۆی لای خۆمانی گەرەکە. منێکی خەڵکی"ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست" و لە وڵاتی خۆم بەوە ڕاهاتوو کە شەوانە تا هەواڵەکانی لەندەن و مۆنتی کارلۆ و دەنگی ئەمەریکا وەرنەگرم ناخەوم، کێچ کەوتە کەوڵم بۆ ڕادیۆیەکی شۆرت وەیڤ. کاری ڕاست بێت بیلێ کایم کە دۆستێکی ئەمەریکیی تەمەن حەفتا ساڵ و ڕۆشنبیر بوو، بۆی پەیدا کردم. کەچی هەرچیم دەکرد ئەو سێ ئێزگەیەی لە سەرەوە باسم کردن بۆم وەرنەدەگیران و بە هەزارحاڵ نووزەیەکی دەنگی ئەمەریکام وەردەگرت، کە لە واشنتۆنەوە بەرنامەکانی پەخش دەکرد و واشنتۆنیش تەنها هەشت سەعاتی ئۆتۆمبیل لە ئەتڵەنتاوە دوور بوو! بۆم دەرکەوت هەموو ئەو ئێزگانە پەرۆشی ئاڕاستەکردنی هەواڵەکانیانن بۆ "خۆرهەلاتی ناوەڕاست"ە حەیاتەکە و ئەورووپای ڕۆژهەلات و ڕووسیا، کەسیش لە ئەمەریکادا تاقەتی نەبوو گوێیان بۆ ڕادێرێ.

لەوێ لە بواری ڕاگەیاندندا، شتێکم نەبینی لە لایەن حکومەتی ویلایەت یان حکومەتی فیدراڵییەوە ئاڕاستەی خەڵك بکرێت. بڕواتان بێت زیادەڕۆیی ناکەم کە بڵێم خەڵك هەر حکومەتی نەدەناسی مەگەر لە تازەکردنەوەی مۆڵەتی شۆفێرییەکەیدا یان بۆ کارێك ڕێی بکەوتایەتە پۆلیس یان سیتی هۆڵ City Hall کە خانە یان بە ئیستیلاحی خۆمان سەرای حکومەت بوو و لە هەموو شارێکدا لە سەر یەك شێوازی بیناسازیی، کە ڕەچاوی نەریت و کولتوورێکی کۆنی دەکرد، دروستکرابوو. ئەو ڕێتێکەوتنەش دەگمەن بوو و کەس تەنانەت پارێزگار یان بەرپرسی حکومەتی شارەکەی خۆیشی نەدەناسی و ڕەنگە بڵێم کەس ئیشی بە حکومەت نەبوو. هەموو ژیانیش زۆر بە ڕێکوپێکی دەڕۆیشت و خەڵکیش بەوپەڕی هۆشیارییەوە گوێڕایەڵ و ملکەچی قانوون بوون.

هیوادارم دواتر بتوانم بگەڕێمەوە سەر هەر بوارێکی ژیان و بە پێی ئەزموون و تێگەیشتنی خۆم باسێکیان لێوە بکەم.

# کریسمەس و بەزمی کریسمەس لە ئەمەریکادا

لە دنیای مەسیحییەتدا جەژنی لەدایکبوونی عیسا بۆنەیەکی ئاینی و کۆمەلایەتیی گەورەیە و سەرجەمی خەلك ئاهەنگی گەورەی بۆ دەگێرن و نەریت و رێورەسمی تایبەتیی خۆی هەیە.

لە ئەمەریکاش، خەلکەکە لە مانگی نۆ و دەی هەموو سالێکەوە خۆیان بۆ ئەم رۆژە ئامادە دەکەن و مالی بۆ دەرازێننەوە و کەلوپەلی ناومال دەگۆرن. بازارەکانیش هەر لەوکاتەوە شمەك و کەلوپەلی پەیوەندیدار بە کریسمەسەوە دەخەنەروو و بە هەزار و یەك رەنگی دەرازێننەوە و سالە و سال خۆیان بۆ ئەو بۆنەیە ئامادە دەکەن و هێندەی خەلك لەو یەك دوو مانگەی پێش کریسمەسدا دیاری و شمەکیان دەکری لە ماوەی مانگەکانی تری سالدا ئەوەندەیان نەدەکری و بەرادەیەك وای بۆ دەچوویت کە بە درێژایی سال رەنجیان بۆ ئەو رۆژە دەدا و لەو ماوەیەدا هەلپەیەکی زۆری شت کرینیان دەکرد و خۆیان بەجاری دەخستە سەر ساجی عەلی. کۆمەلگەی ئەمەریکی خۆی لەخۆیدا کۆمەلگەیەکی ئیستیهلاکییە و بە درێژایی هەفتەیەك کار دەکەن و لە کۆتایی هەفتەکەدا هەرچیەکیان دەست دەکەوێت دەیدەنە جل و خواردن و ئاو بێنە و دەست بشۆ، یان بە درێژایی کارکردنی سالێك پارەیەك پێکەوە دەنێن و سالانە بۆیان هەیە ١٥ - ٢٠ رۆژ مۆلەت وەربگرن و لەو ماوەیەدا سەرپاکی لە گەشت و گەراندا بۆ ویلایەتەکانی تر، کەنەدا و مەکسیك یان گەشتێکی دەریایی خەرج دەکەن و دێنەوە سەر سفر و دیسان لە نووکەوە تێهەلدەچنەوە. رەنگە ئەم خووە لەوەوە سەرچاوەی گرتبێت کە هەموو کەس کاری دەست دەکەوێت و کەس بێ ئیش نیە و ئیتر پێویست ناکات مالی سپی بۆ رۆژی رەش هەلبگرێت، وەك لای خۆمان باوە و گەلێ جاریش دەبێتە هۆی دروستکردنی خەلکی پیسکە و دەستنوقاو و دەردی "رۆژی رەش" تا کۆتایی ژیانی سواری سەری دەبێت.

وەك ئاماژەم بۆکرد هەرچی کۆگا و بازار هەبوو چەند مانگێك پێش کریسمەس، کە دەکاتە ٢٥ ی دیسەمبەر و سەری سالی نوێی زاینی کە دەکاتە ١/١، خۆیان ئامادە دەکەن و هەرچییەك خەلکەکە لەو بۆنەیەدا پێویستیانە دابینی دەکەن و لە مانگی ١١ و١٢دا دار و دیواری ئەو بازارانە دەرازێننەوە و دەبێتە وێنەی بابانۆئێل، کە لەوێ پێی دەلێن سانتا کلۆس.

له نێو كەرەستە و پێداویستییە هەرە باوەكانی ئەو بۆنەیەدا داری كریسمەسە، كە دارسنەوبەرێكی پلاستیكییە بە قەد و گەڵا دەرزیلەییە سەوزەكەیەوە و دەیان گڵۆپ و میزڵدان و باقوبریقەوە. دەبوو هەموو ماڵێكی مەسیحی ئەو دارە بكرێت و بۆ شەوی ١٢/٢٥ لە ماڵەكەیدا بیرازێنێتەوە و بەرزیی دارەكەش بە قەدەر باڵای كەسێكی ئاسایی دەبوو. پاشان هەموو ئەندامانی خێزان دیاریی بۆ یەكتر دەكرن، پیاو بۆ ژن و ژن بۆ پیاو و هەردوكیشیان بۆ منداڵەكانیان و دۆست و دەزگیران و كچە هاورێ و كورە هاورێ بۆ یەكتر. بە تایبەتی دیاریی منداڵان دەخرێتە بن داری كریسمەس و دەستیان لێنادرێ تا شەوی ١٢/٢٥ و بەیانی زوو كە منداڵ لەخەو هەڵدەستن وایان بەگوێدا دەدرێ كە ئەو دیارییانە هی سانتاكلۆسن و شەو لە كاتی خەوتنی ئەواندا هێناوێتی.

لە سەرەتای مانگی دوانزەدا بازاڕەكان هێند قەرەباڵغ دەبن هەر مەپرسە و دەبێتە ڕۆژی حەشر و كارمەندانی بازاڕەكان فریای شت فرۆشتن ناكەون و تەواوی خەڵكەكە بۆخۆی و منداڵ و هاوسەر و هاوڕێی جوانترین دیاری و پۆشاك دەكڕن. داری كریسمەس بە هەزار و یەك جۆری دەفرۆشرێت، بە مەدالیا، بە قاپ و قاجاخ، بە كووپ و پەرداخ، بە پەیكەر.. كورە نازانم بەچی. هەروا خەڵكە و پەلامار دەدات. بێجگە لەوە دەیان و سەدان جۆر كارتی جەژنە پیرۆزە بە سەدان ڕەنگ و دیكۆر و نەخشەوە دەكەونە بازاڕەوە و خێزان و دۆست و ناسیاو لە ناوخۆیاندا دەیگۆڕنەوە و بۆ یەكتری دەنێرن.

دەزگاكانی پۆستەی ئەهلی و حكومی ئەو ماوەیە لەوپەڕی چالاكیدان و ڕۆژانە بە تەن نامە و كارتی جەژنە پیرۆزە دەگوێزنەوە. كۆمپانیاكانی ڕیكلام بە هەزار و یەك جۆر جەژنانە بۆ خەڵك دەنێرن و پرۆپاگەندەش بۆ كاڵای جۆراوجۆریان دەكەن. قوتابخانەكان و چێشتخانەكان و شەقامەكان و هەموو شوێنێكی تری ئەو وڵاتە دەڕازێننەوە و ئاهەنگ و خۆشی بۆ منداڵانی قوتابخانە سازدەكرێت و سانتاكلۆس دیاریی خۆی دەبەخشێتەوە. لەو ڕۆژانەدا ئەوەی بیناسیت و نەیناسیت پیرۆزبایی سەری ساڵ و كریسمەسی لێدەكەیت Happy New Year and Merry Christmas و كەنیسەكان لەوپەڕی خۆسازدان و ئامادەباشیدان بۆ نوێژ و پاڕانەوەی ئەو بۆنەیە. كەسانی سەر بە كەنیسە جۆراوجۆرەكان لەو بۆنەیەدا كۆمەك بەخشینیان زیاد دەكەن بۆ كەنیسەكانیان بۆ یارمەتیدان و دەسگرۆیی كردنی لێقەوماوانی وڵاتەكە و شوێنانی تری جیهان و چەندین ڕێكخراوی مرۆڤدۆستانەی مەسیحی ئەو كارە دەكەن.

ئەوی کە زۆر سەرنج ڕادەکێشێت ئەو هەموو بازاڕە زۆر و پانو پۆڕانەی ئەو وڵاتەیە کە بە چەندین شێوە پێشبڕکێ لەگەڵ یەکتریدا دەکەن بۆ دابینکردنی کاڵای هەمەجۆری ئەو جەژنە بۆ مەعمیل و کڕیارەکانیان و زۆریان لامەبەستە دڵی مەعمیل بەلای خۆیاندا ڕابکێشن چ لەڕووی چاکی و جوانیی کاڵاوە و چ لەڕووی داشکاندنی نرخەوە و ئاسانکاریی بۆ خواست و داواکاریی کڕیارەکانیان.

من لەو ماوەیەدا لە دوو بازاڕی جلوبەرگ کارم دەکرد و بە چاوی خۆم ئاسانکاریی وام دەبینی کە هەندێکیان بە عورف و پێوەری بازاڕی لای خۆمان لە ئەقڵ بەدەرە. من خەڵکم بینیوە چەندین جۆر جلوبەرگی لەو بازاڕە کڕیوە کە خۆم وەك کاشێر کارم تێدا کردووە، بە ماوەیەکی باش لە پێش کریسمەسدا و پاشان بە مانگیش دوای ئەو جەژنە گەلێك لەو جلوبەرگانەی گەڕاندووەتەوە بۆ بازاڕەکە گوایە بەدڵی نین و ئەوانیش بە کۆڵێ سوپاسەوە لێیان وەرگرتووەتەوە و پارەکەشیان بۆ گێڕاوەتەوە و تا بەردەرگاش لە گەڵی چوون و بۆ خواحافیزیی. باشە ئیتر ئەو کڕیارە چۆن بەردەوام ڕوو ناکاتە ئەو بازاڕە، بەمەرجێ کارمەندان باش باشیش زانیویانە کە وا کڕیارەکە ئەو ماوەی مانگ و بگرە زیاترەش ئەو جلانەی چەند جارێك لەبەرکردووە و لە ڕێز و خێراتن بەولاوە هیچیان پێ نەوتووە. لە سیستەمی سەرمایەداریدا بازاڕی ئازاد بەو جۆرە، لەڕووی چاکترکردنی کاڵاو دابەزاندنی نرخ و ڕاگرتنی دڵی کڕیارەوە پێشبڕکێ لەگەڵ یەکتر دەکەن، کەچی لە بازاڕی بەناو ئازادی لای خۆماندا بازرگانی مفتخۆر و لەپڕێکدا هەڵتۆقیو دەگەڕێن کام کاڵا خراپ و هەرزانبابیە لە بازاڕەکانی وڵاتانی کۆدەکەنەوە و بەو نرخەی کە هیچ یاسا و ڕێسایەکی ئابووری نایگرێتەخۆ بە سەر خەڵکیدا ساغدەکەونەوە و چ منەت و باکیشیان بە کەس نیە و دە بە قەد ئەو گومرگ و بەرتیل و شیرینییەی دەیداتە کاربەدەستان ئەو قازانجی مۆڵ دەخاتە گیرفانی و کاڵاکەشی بایی پوولێکی قەڵبە.

بۆ جەژنی کریسمەس دەیان ئاسانکاریت لە جۆری کاڵا و داشکاندنی نرخدا بۆ دەکرێت و بەتایبەتی لە جل و دیاری و یاری و لەیستۆکی منداڵاندا کەچی بازاڕی شێواو و بێبنەمای ئابووریی لای خۆمان ئەوەندە لە جەژنە ئاینیەکاندا ساختە و گرانفرۆشی دەکەن لە هیچ کاتێکی تردا ئەوەندە ناکەن.

لەو بازاڕانەدا ئێستا کار ئاسانیی ئینتەرنێتیشی هاتووەتە سەر، تۆ دەتوانی هەر نەچیت بۆ بازاڕەکە و تەواوی ئەو کاڵایانەی پێویستت پێیەتی لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە داوایان

بکەیت و بەو خاسییەت و نرخەی کە پێشتر بۆت دەخرێتە ڕوو پارەکەیان بۆ بنێریت و ئەوانیش بە جوانی بۆت دەپێچنەوە و بۆت پۆست دەکەن.

من لە زنجیرە نووسینەکانی پێشترمدا باسی ئەوەم کردووە کە چۆن ماڵە مەسیحییەکانی سەر بە کەنیسەی سانت دێڤیدی شاری ڕۆزوێلی نزیک ئەتلەنتا میواندارییان کردین و هاوکارییەکی باشیان کردین و من جگە لە مرۆڤدۆستی هیچ مەبەستێکی ترم تێدا بەدینەکرد و لە مرۆڤپەروەریی زیاتر چ کارێکیان بە منێکی ئاوارەی ماڵوێران هەبوو، کە بە ڕەشەخێزانێکی ڕەهەندەی وڵاتەکەی ئەوان بووبووم و تەنانەت ناوی وڵاتەکەی منیشیان نەدەزانی و لای ئەوان کوردستان و هندستان و هەموو ستانەکانی تر هەر یەك شتی دەگەیاند کە نەدەیانزانی چیە و نەشیاندەزانی لە کام قوژبنی گۆی زەویدایە. بەڵێ ئەوانە و بەتایبەتی دوو خانمی جوان و مرۆڤپەروەریان کە ناویان میشێل وۆرد و شێلبی کرێن بوو لە کریسمەسی ساڵی ١٩٩٨ دا و پاش ئەوەی کە زیاد لە نۆ مانگ بوو لەوێ بووین و قۆناخی میوانی و نەشارەزاییمان تێپەڕاندبوو و بۆ خۆمان ئیشمان دەکرد، ئا ئەوانە بە بارستایی منداڵەکانم دیارییان بۆ هێنان و سەرباری ئەوەش لە ناخی دڵەوە هاوخەممان بوون لە غوربەتی تاڵی دوور لە زێد و نیشتمانی خۆماندا. من ئێستا هەواڵی ئەو دۆستانە نازانم بەڵام لە یادەوەریمدا و لە قووڵایی ناخمەوە وەك فریشتە تێیاندەڕوانم و یادیان دەکەمەوە.

# جـــەژنـــی قـــەل و .. جـــەژنـــی کـــوولـــەکـــە زەرد

ڕەنگە ئەم ناونیشانەتان بەلاوە کەمێك سەیر بێت و من بـۆ خۆیشـم ئـەو دەمـەی لـەوێ بووم ئەم جەژنە زۆر سەرنجی ڕاکێشام و لەوەش سەیرتر جەژنێکی ئاینیی تـر هـەبوو بـە ناوی هەڵەوینەوە Halloween و ڕێوڕەسمی بەڕێوەچوونی بۆ منداڵان لە هی شەوی بەراتی لای خۆمان و بە تایبەتی شاری سلێمانی دەچوو و لەمەیاندا کوولەکە زەرد ڕۆڵێکی سەیر و سەمەرە دەبینێ. ئەم دوو جەژنە لەو وڵاتە دەکەوتنە مانگی تشرینی دووەم ــ نۆڤەمبـەری هەموو ساڵێکەوە. جەژنی هەڵەوین لە کولتـووری دنیـای مەسـیحییەتدا پێیدەوتـرێ ئێـوارە جەژنی هەموو پەرساکان، کـە بـە عـەرەبی دەکاتـە "عشـیة عیـد جمیـع القدیسـین" و ڕێـك دەکەوێتە ئێوارەی ٣١ ی ئۆکتۆبەرلە سەر ١ ی نۆڤەمبەر. ئەم جەژنە بەتـەواوەتی لـە ئـاینی مەسیحیدا لە چییەوە سەرچاوەی گرتووە ئەوەیان نازانم، بـەڵام لـە خاسییەت و ڕواڵـەتیدا پێدەچوو زیاتر بۆ دڵخۆشکردنی منداڵان بێت و کوولەکە زەرد تێیدا ڕۆڵێکی کاریکاتێرانـەی سەیر دەبینێ و نازانم ئەمەشیان لە پای چیە.

جارێ با کەمێ بێمە لای ئـەم کوولەکەیـەوە و بـە پێـی توانـا بەخوێنـەری بناسـێنم لـە وڵاتی ئێمەدا چەند جۆرێك کوولەکە هەیە کە باوترینیان کوولەکە ئاساییە بچکۆلەکەیە ؛ ڕۆژانە لە بازاڕدا دەبیـنرێ و لـە هـەندێ شـوێن پێـی دەوتـرێ کوولەکە سـەقزی و ڕەنگـی سەوزباوە و بۆ شلە و یاپراخ و شێخ مەحشـی بـەکاریدێنن و لـێرە کـە وتـت کوولەکە هـەر ئەوە بەخەیاڵدا دێت و بە ئینگلیزییەکەشی زووچینی zuchiny پێدەوتـرێ و لـەوێش وەك باو هەر ئەو کوولەکەیەیە و ئەو ناوکە کوولەکەیەش کـە سپییە و ئاشـنایە بـە هـەموومان تـۆوی ئـەم کوولەکەیەیانـە. هـەر لای خۆمـان دوو جـۆری تـر کوولەکـە هـەن و قـەبارەیان کەمێك گەورەیە یەکەمیان کولەکە سواڵی پێدەڵێن و بە ناسکی زۆر خۆشە بۆ چێشتە شلە بـەڵام زۆر بـاو نیـە و بـە کـەمی لـە بـازاڕدا دەفرۆشـرێ. جۆرەکـەی تـر کـە مەبەسـتمانـە کوولەکە زەردە و قەبارەیەکی گەورەی هەیە و تامێکی شیرین و ڕەنگێکی زەردی سوورباو. لای خۆمان زۆر بەکەمی دەیروێنن و تەنها پایزێکی درەنـگ و سـەرەتای زسـتان لـە بـازاڕدا دەبینرێت و وا باوە تەنـها ماڵە کۆنـەکان و ژنـی سـەرە و قـەیم سـاڵی یـەك دوو جار وەك ترخێنە لێیدەنێن و ئەوەندەش باو نیە بـۆ خـواردن و مـن بیرمـە دایکی ڕەحمـەتیم سـاڵی جارێ لێیدەنـا و پـڕی دەکـرد لـە نـۆك و دەرمـانی هەمـەجۆری چێشـتلێنان و ئـەوجا نەشمدەخوارد و گاڵتەم بەو چێشتە شیرینە دەهات. بیرمە لە ساڵانی هـەژاری و قـاتوقڕیدا

زیاتر ماڵە هەژار و ماڵە جووتیاری نیوەکۆیلەی دەستی ئاغا و دەرەبەگ ئەم کوولەکە زەردەیان دەخوارد لە گەرمیاندا.

ساڵ هات و ساڵ ڕۆیشت و لە دوادوایی ساڵانی سەدەی بیستەمدا ڕێکەوت و قەدەر ڕەهەندەی ئەمەریکای کردم و تەماشا دەکەم لەوێ کوولەکە زەرد خۆی لێکردووم بە "بووك!" و ڕێزێکی زۆری لێدەنرێ و تەنانەت لە جەژنێکی ئاینیی زۆر پیرۆزیشیاندا دەیرازێننەوە و دەموچاو و لووت و برۆی بۆ دەکەن و لە شوێنێکی جوان و قەشەنگی ماڵدا دایدەنێن. من ئەو دەمە کوڕ و کچێکی بچکۆلەم بوو لە پۆلی دوو و سێی سەرەتایی و لە قوتابخانەی میمۆسای شاری ڕۆزویڵی نزیك ئەتڵەنتا دەیانخوێند. حەفتەیەك لە پێش جەژنی هەڵەویندا هەموو ڕۆژێك منداڵەکان دەگەڕانەوە و باسی نەخشاندنی کوولەکە زەردیان بۆ دەکردین کەوا هەر پۆلێك کوولەکە زەردی خۆی دەنەخشێنێ و دەموچاوی بۆ دەکات و بۆ ئەو جەژنەی دەرازێنێتەوە و مامۆستاکان پێیانوتبوون لە عارفەی جەژندا تیروپشکیان بۆ دەکەین بزانین هەر پۆلە و کوولەکەکەی بەر کێ دەکەوێت و ڕۆژانە منداڵەکانی من دەست بە دۆعاوە بوون بەڵکو بۆ ئەوان دەربچێت. دوای نیوەڕۆی ٣١ ی ئۆکتۆبەر کە منداڵ لە قوتابخانە هاتنەوە تەماشا دەکەم ڕەنجی کوڕم کوولەکە زەردێکی گەورەی بە باوەشەوەیە بە ڕازاوەیی و نەخش و نیگاری دەموچاوێکی جوانەوە کە لە سەر کوولەکەکە دروستکراوە و لە خۆشیاندا پێی وە زەوی ناکەوێت و هاوار دەکات بۆ من دەرچوو! هەر لەگەڵیشیدا یەك قاپی پەپکەیی گەورە حەڵوای کوولەکە زەردیشیان دابوویە و پێیانوتبوو بە ڕێزەوە لە سەر مێزی نانخواردن دایبنێ. منیش لە ماڵەوە کە تەماشام کرد دەردی کابرای کوردە وتم دار و بەرد بباریٚ خۆ ئەم کوولەکەیە لای ئێمە کەس لای لێناکاتەوە کەچی لێرە ئەم هەموو بەزم و ڕەزمەی بۆ دەکەن! ڕاستێکەی لەم وڵاتەدا ئەم کوولەکەیەم بە چێشتی نەبینی بەڵام خۆشترین و گرانبەهاترین حەڵوای لێدروست دەکەن و پێیدەڵێن حەڵوای کوولەکە زەرد pumpkin pie و هەمیشە لە هەموو بازاڕێکی خواردەمەنیدا دەست دەکەوێت و ئەمەریکیش بە جوانترین دیاریی دەزانێت بۆ ماڵە دۆست و ناسیاوەکانی.

ئێوارەی جەژنی هەڵەوین خانمە ئەمەریکییە دۆستەکانمان، شێڵبی و میشێڵ و سوزان پێرشینگ و لۆرا دۆڤەر و کێ و کێ هاتن بۆ پیرۆزبایی و کەوڵی شێر و پڵنگ و ڕێویشیان هێنابوو بۆ منداڵەکانی من و تێیانگەیاندین منداڵەکان بۆ ئێوارە و شەو ئەو جلانە لەبەر بکەن و لە گەڕەکدا بسوورێنەوە و لە دەرگای ماڵان بدەن و بڵێن تریکە تریك trick a trick و ماڵانیش نوقڵ و شیرینییان بە سەردا دەبەخشنەوە. کەوابوو مەسەلەکە بەراتەکەی لای خۆمانە!

لە گەڵ بانگی ئێوارەدا کۆمەڵێك منداڵ بە دەنگی ناسکی تریکە تریك لە دەرگایانداین و منیش کاندی و شیرینیم بۆ بردن، ئەڵبەتە هەر شتە و لە زەرف و پاکەتی خۆیدا و تەماشا دەکەم زۆربەی منداڵەکان بە جلی هەمەجۆری ئاژەڵ و پەلەوەرەوەن و زۆربەشیان دایك یان باوکیان لەگەڵدایە، چونکە لێرە کەس ناوێرێ چاوتروکانێکیش چیە بە تەنها منداڵەکەی بەرەڵا بکات لەبەر دیاردەی ترسناکی منداڵ فڕاندن. چونکە کە منداڵەکەت لە دەست بووەوە جارێکی تر نایبینیتەوە و لە شوێنێکی تردا دێمە سەر ئەم باسە. پاشان دوو منداڵەکەی منیش کەوتنە تەکیان و خۆیشم دوایانکەوتم و لەوێدا بەتەواویی بۆم دەرکەوت کەوا جیهانی منداڵ چەند جوان و بێگەردە و تێکەڵەی ئەمەریکی و ئاسیایی و ئەفریقایی منداڵ بە ڕەنگی سپی و ڕەش و بۆریانەوە، بەدەر لەوەی کە بە چ زمانێك قسە دەکەن، هەموو بە یەك دەنگ هاواریان دەکرد تریکە تریك و لە دەرگای ماڵانیان دەدا و خاوەن ماڵەکانیش بە ڕوویەکی گەشەوە کاندی و نوقڵیان بەسەردا دەبەخشینەوە و ئێمەی باوك و دایکانیشیان پێ بە پێ شوێنیان دەکەوتین. هەندێ ماڵ پارچە کاغەزێکیان بە سەر دەرگاکەوە هەڵواسیبوو "تکایە لە ماڵ نین"، هەندێکیتر نووسیبویان "تکایە لە دەرگا مەدەن"، هەندێکیش کاندی و نوقڵیان حازر نەبوو بۆیە هەر منداڵە و تاك دۆلارییەکیان دەدایە. پێموایە لە هەموو ساڵەکەدا تەنها ئەم شەوە بۆت هەیە لە دەرگای ماڵە ئەمەریکییەك بدەیت بێئەوەی بیناسیت یان پێشتر تەلەفۆنت بۆ کردبێت، دەنا پەیوەندیی کۆمەڵایەتیی هێند گەرموگوڕ نیە، لای خۆمان ئاسا، لە دەرگای ماڵان بدەیت و خاوەن ماڵیش بێئەوەی بتناسێ فەرمووت لێبکات. دواجار منداڵەکانم برد بۆ ماڵی کاك ئازاد و ئاشنا خان، کە ژن و مێردێکی گەنج بوون و زۆربەی کاتیان لە ئیش بوون، بە هەمان شێوەی تریکە تریك دەرگایان لێکردینەوە و ئەو دەمە تەزووی یادێکی شیرینی شەوی بەراتی لای خۆمان ڕایچڵەکاندین و لە ناخی هەستکردن بە غوربەتێکی کوشندە و تاڵەوە فرمێسك زایە چاوم.

بۆنەی دووەم، ئەوەیە کە من ناوم لێناوە جەژنی قەل و ڕاستێکەشی لەمەیاندا لە جیاتی کولەکە زەرد قەل یان عەلەشیش مەلیکی سەر سفرە و خوانە و جەژنەکە دەکەوێتە ڕۆژی ٢٦ ی نۆڤەمبەرەوە (یان دواین ڕۆژی پێنجشەمەی مانگی نۆڤەمبەر) و پێی دەڵێن جەژنی سوپاس یان سوپاسگوزاری یان شوکرانەبژێری Thanksgiving. ئێوارەی ئەو ڕۆژە هەموو ماڵە ئەمەریکییەك قەل لێدەنێت، بەڵام بە شێوەی قەل و برنجی لای خۆمان نە، بەڵکو قەلەکە لە شەراب هەڵدەکێشن و پاشان وەك دەنووکی کەو لە فڕندا دەیبرژێنن و بە دەستووری قەیسی و پڵاوەکەی بەیانیی زووی جەژنی ڕەمەزان و قوربانی لای خۆمان ناکرێ ئەو قەلە نەچێتە سەرخوانی هیچ ماڵێك.

پێموایە ئەم جەژنە زیاتر لە ئەمەریکادا پەیڕەوی بکرێت و لە نەریتی دێرینی مەسیحییەتدا نەبێت و زیاتر لەو خەڵکەوە داکەوتووە کەوا کاتی خۆی لە ئەوروپاوە لە تاو زوڵم و زۆری کەنیسە ڕەویان کردووە بۆ ئەمەریکا و لە زەویوزاری بە پیت و بەرەکەتی ئەو کیشوەرەدا کشتوکاڵیان کردووە و خێروبێرێکی زۆریان دەستکەوتووە و حاڵ و گوزەرانیان باش بووە و ئەم ڕۆژەیان کردووە بە ڕۆژی سوپاسگوزاری و نەریتی قەلەکەش بە زۆری لەوەوە هاتووە کەوا سپیپێستە هەڵاتووەکانی ئەوروپا لە سەر خاکی ئەمەریکا دابەزیون و یەکەمجار بوون بە میوانی خێڵە ڕاوچی و کۆچەرەکانی هندییە سوورەکان و ئەوانیش وەك ڕێزگرتن لە میوان قەلیان بۆ سەربڕیون و پاشان سپی پێستەکان نمەك بەحەرام دەرچوون و وردە وردە شوێنیان بەو خێڵە هندیانە لەقکردووە، کە دانیشتووی ڕەسەنی وڵاتەکە بوون و دواجاریش قڕیان تێخستن و نەیانهێشتن، بەڵام ئەو نەریتە جوانەی قەلیان لێوەرگرتن و کردیانە سیمبوڵی جەژنی سوپاسگوزاری.

بە گشتی لە بازاڕەکانی ئەمەریکادا قەل بە چەند جۆرێك دانراوە و هەیانە دووکەڵدراوە و ئەمەریکییەکان زیاتر لەو جۆرەیان دەکڕی. ئێمە کە هەفتانە دەچووین بۆ بازارکردنی میوە و سەوزە و خواردەمەنی قەلێکی پاککراوی ٦ – ٧ کیلۆییمان بە نزیکەی پانزە دۆلار دەکڕی کە پارەیەکی زۆر نەبوو و لەگەڵ شتی تر هەرزانتر بوو و بەشی سێ چوار ژەمی چاکی دەکردین. ئێمە کە هەموو حەفتەیەك قەلێکمان دەکڕی لە بەر هەرزانییەکەی بوو، دەنا خواردنی دەریایی sea food و بەزۆریش قرژاڵ بە هەموو جۆرەکانیەوە، کە ئەمەریکییەکان زۆریان حەز لێبوو، هەندێ جۆریان کە شیمپیان پێدەوت shrimp کیلۆی بە بیست دۆلار و بگرە زیاتریش بوو. خۆ چێشتخانەکانی ڕێد لۆبستەر Red Lobster ، بە واتای قرژانگە سوور، کە لە سەرانسەری ئەمەریکادا لقیان هەبوو گرانترین قرژاڵ و خواردنی بەحرییان هەبوو. جا ئێمەیەکی ڕاهاتوو بە سیستەمی خواردنی وڵاتانی وشکایی، کە سەد دۆلاریشیان بداینایەتی تەبیعەتمان نەیدەهێنا تۆزقاڵێك لەو قرژاڵە بخۆین، بۆچی بە ئارەزووی خۆمان ئەو قەلە هەرزان و حەیاتە نەماشینەوە.

ئەوەی زۆر سەرنجڕاکێش بوو لە عارفەی جەژنی شوکرانەبژێریدا، کە هەموو ماڵێك دەبێ وەك نەریت قەلێکی ساغ بکڕێت، نرخی قەل لەجیاتی ئەوەی بەرزبێتەوە دابەزییە سەر نیوە و کەمتریش. لای ئێمە لە جۆرجیا ئەو قەلەی لە ڕۆژانی ئاساییدا بە ١٥ دۆلار دەمانکڕی بوو بە ٧ دۆلار و تەلەفۆنم کرد بۆ کاك شیروان مەهدی هاوڕێم لە کۆلۆرادۆ و وتم مژدە قەل لای ئێمە بوو بە ٧ دۆلار، وتی حەو لای ئێمە بوو بە پێنج دۆلار!

# کــــچه هـــاوڕێ و کـــوڕه هـــاوڕێ

قەشەی کەنیسەکەی سانت دێڤید، لە شاری ڕۆزوێلْ، کە وەك پێشتر باسم کرد زۆر بەدەممانەوە هاتن و ئەو کارەی ئەو ژنانەی سەر بەو کەنیسەیە بۆیان کردین دایك و خوشك و برا بۆ یەکتری ناکەن لای ئێمە. قەشە پیاوێکی تەمەن شەست ساڵی سوور و سپی و قەشەنگ و ناوی فازەر هاریسۆن بوو زۆری ڕێز لێدەنام و بەردەوام دەیوت نەریت و فەرهەنگی ولاّتی خۆتان بپارێزن و چەند جارێکیش لەگەڵ کێرلی ژنی و ڤەرجینیای کچیدا، کە زۆرجوان بوو لە ماڵەوە سەریان لێدەداین و گەلێ پێداویستیی ماڵیشیان بۆ دابینکردین. ڕۆژێکیان وەك ڕێزلێنانێك بۆ هەڵوێستی مرۆڤدۆستانەیان، لە ماڵەوە خواردنی لای خۆمانمان بۆ ئامادەکردن، کە ئەمەریکییەکان زۆریان حەز لێبوو، تەماشامان کرد تەنها فازەر و پیرەژنەکەی هاتن، وتمان ئەی ڤەرجینیا، وتیان ئەو لەگەڵ ئێمە ناژی بەڵکو لەگەڵ بۆی فرێندەکەیەتی و منداڵێکیشیان هەیە. ڕاستێکەی منیش زۆر پێی پەست بووم و هێندەی نەمابوو وەك مامۆستا قادرەکەی ئاوایی شێخ لەنگەری لای کەلار بڵێم دەعوەت فاشیل! هەر لەو سەروبەندەدا جارێکیان ماڵی مستەر لویس و لیندای خێزانی بانگهێشتی ئێمە و خێزانە کوردەکەی تری خزممانیان کرد بۆ ماڵی خۆیان و پێشوازییەکی گەرمیان لێکردین و یەك بە یەکی ئەندامانی خێزانەکەیان پێناساندین، ئەوە گرێکی کوڕمانە تەمەنی هەژدە ساڵە و ئەمساڵ دەچێتە زانکۆ، ئەوە جاسیکای کچمانە تەمەنی بیست و یەك ساڵە و ساڵی دووەمی زانکۆیەتی و ئەم کوڕەش ناوی ماتە Mat و بۆیفرێندی "کوڕە هاوڕێی" جاسیکایە و هەر لە ماڵی خۆمان لەگەڵ جاسیکا دەژیو دایکە و باوکە ئەوەندەیان مات خۆشدەویست هەر مەپرسە.

لەوێ ئەو خێزانانەی کچەکانیان زۆر خۆشبویستایە ئەوە کوڕە هاوڕێ نانی دەکەوتە ڕۆنەوە و بەردەوام شەوو ڕۆژ لە ماڵی باوکی کچەبوو، واتە بە ئیستیلاّحی خۆمان دەبوو بە زاوارێوی. گەلێکی تریش لە کوڕ و کچە هاوڕێکان دەچوون خانوو یان شوقەیان بۆ خۆیان دەگرت و بۆخۆشیان کاریان دەکرد و هەندێکیان لەپاڵ ئەوەشدا دەیانخوێند. ژمارەیەك لەوانە منداڵیان دەبوو، هی واشیان هەبوو پاش منداڵێك و دوان ئەوجا دەیانکرد بە زەواجی ڕەسمی، یان هەر زەواجیان نەدەکرد و هەندێ جاریش لە یەکتر جیادەبوونەوە و منداڵەکان بەر دایك دەکەوتن و دەبوو باوکەکەش تا تەمەنی ٢٢ ساڵییان نەفەقەی بکێشانایە.

جارێکیان ماڵی مستەر لویسم بانگهێشتی نانخواردن کـرد لـە مـاڵی خۆمـان و زۆریـان پێخۆشبوو کە جەختم لـە سـەر هـاتنی مـاتیش کـرد لەگەڵیاندا. کـاتی نـانخواردن بـە دەسـتووری ئـەوێ زۆرم موجامەلـەکردن و دانیشـتنمان لـە سـەر خوانەکـە ماوەیـەکی خایاند و لـە پـەناوە لینـدای خـێزانی مستەر لویـس پێـی وتم: محەمـەد، ئێمـە لـێرە دەمێنینەوە و با جاسیکا و مات بڕۆنەوە بۆ مـاڵ پشووی خۆیـان بـدەن چونکە ئـەوان گـەنجن. مـن و دایکـی منداڵـەکان بـە بزەیەکـەوە تەماشـایەکی یـەکترمان کـرد و وتمـان دیارە لیندا خانم لە فلاَنە ژنـی خزممـان دەچێت، کـە خەسوویەکی لەڕادە بـەدەر زاوا پەرستە.

سوزان پێرشـینگ، ژنـی پیاوێکی زۆر دەوڵەمـەندی ناوچەی ئەتڵـەنتا بـوو و پشـکێکی زۆریان هەبوو لە کۆمپانیای کارەبای ویلایەتەکانی باشووری ئەمـەریکادا و خـوا هـەڵناگرێ لە سەرەتاوە زۆر هاوکاری کردین و بەدەممانەوە هات و تەنانـەت هێنـد عـاتیفی بـوو زۆری بـەزەیی بـە منداڵە وردەکـانی منـدا دەهاتـەوە لـە سـەرەتای خوێندنیـاندا لـەو ولاَتـە و ڕانەهاتنیان لەگـەڵ کـەش و هـەوای ئـەو ولاَتـە و ئـەو غوربەتـەی تووشمـان هـاتبوو. بـەلاَم سـەیر لەوەدایـە هـەر ئـەوەندەی بەرنامەکـەی لەگـەڵمان تـەواوبوو ئیـتر کۆڵـی لێدایـن و تەلەفۆنێکیشی بۆ نەکردینەوە. ئەم خێزانە تاقە یەك کچی تەمەن نزیکەی بیست ساڵیان هەبوو لە زانستگە دەیخوێنـد و جارێکیـان لەگەڵ دایکی هاتـە سـەردانمان و باریکەلەیـەکی جوان بوو، ناوی کۆردنی بوو. ڕۆژێکیان تەلارخانی خوشکی ئازاد کە لە کوردسـتان وازی لـە چوارەم ساڵی کۆلێجی پزیشکی هێنا و لەگەڵمان هات بۆ ئەمـەریکا، لەگەڵ سـوزان چووبـوو بۆ ماڵیان و کە هاتەوە بە سەرسامییەکەوە پێی وتم کاك محەمەد کۆردنی لە ماڵی خۆیاندا شەش وێنەی لە چوارچێوە گیراوی کوڕانـی هەڵواسیوە و پێـی وتـووم ئەمانـە هەریەکـە و ماوەیـەك بۆیفرێنـدم بـوون و شەشـەمیانی لـە چوارچێوەیـەکی زێڕیـن گرتـووە گوایـە لـە پێنجەکەی پێشوو باشترە.

کە لە بازاڕی مارشاڵ کارم دەکرد ژنێکـی ئەمـەریکیی دەمودوو خـۆش بووبـووە هاوڕێی من و دایکی منداڵەکان. ئەم ژنە کوڕ و کچێکی گەنجی هەبوو هەریەکـەیان و بـە تەنـها لـە ویلایـەتێك دەژیـا و دایکەکـە زۆر بـۆ کچەکـەی دەکڕووزایـەوە کـەوا تـا ئێسـتا بـەختی نەیهێناوە و بۆی فرێندی نیە!

هەر لە هەمان بازاڕدا کچێکی تر هەبوو ناوی هێسەر بوو، هەتا بڵێی ئاقڵ و جوان بوو. ڕۆژێکیان منداڵێکی پێنج شەش ساڵی بەدەستەوە بوو و لە هەمان کاتیشـدا دووگیـان بـوو و لە ماڵەوەی ئێمەی پرسیبوو مێردەکەت چی دەکات و چی ناکات، ئـەمیش وەك موجامەلـە پرسـیاری کـاری مێردەکـەی ئـەوی کردبـوو، کـەچی ڕاشـکاوانە وتبـووی جـارێ شـووم

نەکردووە و ئەم منداڵانە لە کوڕێکی هاوڕێمن، ئەمیش بە کوردی وتبووی: "دەك لاولۆت بڕن!".

ئەو دەمەی لە بازاڕی بیرلنگتن کارم دەکرد و سەرپەرشتیاری بەشی پۆشاکی پیاوانە بووم و بە دەستووری کارەکە دەبوو ڕووم لەگەڵ کڕیارەکان خۆشبوایە و بە قات و بۆینباخیشەوە دەوامم بکردایە. ڕۆژێکیان ژن و مێردێکی کامڵ هاتنە ئەوێ و پیاوەکە نازانم کراس یان پانتۆڵ بوو کڕیبووی و لە ژووری تاقیکردنەوە لەبەریدەکرد و لەو کاتەدا ژنەکە وەك موجامەلە پێی وتم: بێزەحمەت خەڵکی کوێی؟ منیش ئەوەندەم لە وەڵامی ئەم جۆرە پرسیارانەدا وتبوو کوردستان و هەر بە هندستان تێدەگەیشتن بێزار بووبووم و لەبەر ئەوە ئەمجارە وتم عێراق، کەچی ژنە زۆر گەشبووەوە و وتی عێراق کە دراوسێی ئێرانە؟ وتم بەڵێ و کە پرسیاریشی لێکردم ناوم چیە و لەوەڵامدا وتم محەمەد ئەوەندەی تر شاگەشکە بوو و وتی ئێمەش محەمەدێکمان هەیە، وتم خێر ئەم محەمەدەی ئێوە کێیە؟ وتی بۆیفرێندی کچەکەمانە و دایكو باوکی خەڵکی ئێرانن بەڵام محەمەد خۆی لە ئەمەریکا لەدایکبووە و ژیاوە و هێندە شەیدای کچەکەمانە ئەوسەری نەبێتەوەو بەردەوام هەر لەماڵی خۆمانە، منیش زۆرم پیرۆزبایی لێکرد و لەدڵی خۆمدا وتم "بەڵام من وەك محەمەدەکەی ئێوە نانم لە ڕۆندا نیە!".

لەو وڵاتە پێشکەوتووەدا ڕاستە ژن گەڵێ مافی بۆ دەستەبەر بووە و بە ئارەزووی خۆی جل لەبەردەکات، نیوە ڕووتە یان هەر ڕووتی تەواوە کەس هەقی بە سەرەوە نیە. ژنی موسڵمانی وا هەیە لەچکی بە سەرەوەیە و ژنە هندیی واش هەیە دە دوانزە مەتر قوماشی لەخۆی ئالاندووە و هەشە تەنها شۆرتێکی لەپێدایە و بستێك لە خوار هەرامەکەیەوەتی. ئەگەریش لە ماڵدا چێشت لێبنێن ئەوە زیاتر ئەرکی پیاوە! بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر دەگمەنە لە کۆمەڵگەی ئەمەریکیدا ژنێك بەیەك مێردەوە بوەستێ و جارێ دوان تەڵاق نەدرابێ. لەبەرئەوە ئەگەر ژنێکی ئەمەریکی مێردێکی باشی دەست بکەوێت زۆر شوکرانە بژێرە و کە دەڵێ مێردەکەم هەزار مێردەکەمی لە زار دەباریٚ و زۆریش دڵسۆزێتی و جاری وا هەیە کچ دوای گۆڕینی چەند بۆیفرێندێك شوو دەکات و بەلاشیەوە نەنگی و شوورەیی نیە و گەڵێ جار بە چاکە و پیاوەتی باسی ئەو هاوڕێیانەی دەکات بەڵام هەستی مێردەکەی و دڵسۆزیی بۆ منداڵەکانی ڕادەگرێ. من ئەم ڕەفتارە جوانەم لە شێلبی و میشێلدا بینی، کە دووژنی ئەمەریکیی نزیکمان بوون و زۆر پەرۆشی مێرد و منداڵەکانیان بوون. پیرەژنێکی خەڵکی ئەوێ هاتوچۆی دەکردین و دەیوت کچەکەم شووی کردووە بە پیاوێکی عەرەبی خەڵکی لیبیا و لەبەر ئەوەی میوانی عەرەبیان دێت کچەکەم قەت شۆرت لە پێ ناکات، بە مەرجێ ئەو پیرەژنە خۆی شۆرتی لەپێدابوو. پیاوێکی عەرەبی سووریی

ژنێکی ئەمەریکی هێنابوو، ژنە ببووە موسڵمان و سەرباری ئەوەش کابرا دەینارده مەکتەبێکی فێرکردنی قورئان. گەلێ ژنی ئەمەریکی حەزیان لەوەیە شوو بکەن بە خەڵکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ژیانێکی ژن و مێردایەتیی ئارام ببەنە سەر و هەموو ڕۆژ تەڵاق نەدرێن. کاتێ لە گوام بووین کاك سابیری برادەرم ئاگاداری کردمەوە کەوا ژنێکی ئەمەریکی، ناوی جین نیکۆڵسە و بیستوویەتی خەریکی وەرگێڕانی کتێبی جینۆسایدم و زانیاریی ئەو بوارەم لایە، لەبەر ئەوە دەیەوێ لە نزیکەوە بمناسێت. من لە زەینی خۆمدا وێنەی ئافرەتێکی مۆدێرنی ئەمەریکیم بۆ کێشابوو، بەڵام کاتێ بینیم تەماشا دەکەم جلێکی شۆڕی ئاودامانی لەبەردایە و کە دەستم برد تەوقەی لە گەڵ بکەم داوای لێبووردنی کرد و وتی دەستنوێژەکەم دەشکێ! منیش لە دڵی خۆمدا وتم خوا بە زیادی خێری نەکات ئەمە چیە!؟ برادەرەکەم، کە هەستی بەو شڵەژانەی من کرد، فریام کەوت و وتی ئەم خانمە خێزانی پیاوێکی عێراقیی خەڵکی نەجەفە.

ئەو ئازادییەی سێکس لە ئەمەریکادا دوو دەردی زۆر کوشندەی لێکەوتووەتەوە یەکەمیان نەخۆشی ئەیدزە کە ژمارەیەکی زۆر خەڵکی گرفتار کردووە و وایلێهاتووە ئێستا سەرباری بەکارهێنانی کۆندۆمیش مەترسییەکی زۆر لەو کارە دەکەن و ترس و لەرزێکی هێجگار سامناکی بەرپاکردووە و کارێکی کردووە کە بە تەواوەتی نەوێری بە دڵی مەرحەبای ژنێك بکەیت نەوەك هەر بە تەماشاکردنیشی تووشی ئەو دەردە پیسە بیت. ئامارێکی تەندروست ویلایەتی چۆرجیا ئەوەی دەردەخست کەوا ڕێژەیەکی سامناکی خەڵکی ئەو ویلایەتە هەڵگری ڤایرۆسی HIV ن، واتە ڤایرۆسی ئایدز کە درەنگ بێت یان زوو هەر تووشی دەبێت. وەك ئیجرائیچکی پارێزگاری هەر کچێك تەمەنی لە شانزە ساڵ تێپەڕێت دەتوانێ بچێتە نەخۆشخانەکان و هەموو کات بەشی خۆی کۆندۆم وەربگرێت. هەر کچ و کوڕێکیش ببنە ئاشنای یەکتر دەتوانن بچنە نەخۆشخانە و بە وردی خۆیان فەحس بکەن بۆ دڵنیابوون لە تەندروستییان، بە تایبەتی لە ڕووی ئایدزەوە.

دووەمیان ئەو ڕێژە زۆرەی منداڵی دایك دیار و بێباوکەیە لەو وڵاتەدا کەوا چەندین گرفتی کۆمەڵایەتی و دەروونیی لای ئەو منداڵانە بەرپاکردووە و هەمووشی لە ئەنجامی پەیوەندیی سێکسیی دەرەوەی یاسا و ڕێسای ژن و مێردایەتییەوەیە. پێموایە لە ئایندەیەکی دوور یان نزیکدا دەبێتە ماکی هەڵتەکاندنی بنەما ئەخلاقیەکانی ئەو کۆمەڵگایانە و لە ئەنجامیشدا هەرەسهێنانی سەرجەم سیستەمی ئابووری – سیاسیی – کۆمەڵایەتیی – ئەخلاقیی سەرمایەداری و ئەگەر کەسێکیش بە وردی بڕوانێتە کاریگەرییە سەلبیەکانی ئەو دیاردانە تێدەگات بوونەتە چ خۆرەیەکی بوون و بەردەوامیی ئەو سیستەمە.

# خوێندنی منداڵەكانم لە ئەمەریكادا

كۆتایی ساڵی ١٩٩٦ كاتێ وڵاتمان بەجێهێشت منداڵەكانی من لە قۆناخی سەرەتایی و ناوەندیدا بوون، ئەو ساڵە تازە ڕەنجمان خستبووە قوتابخانە و سۆزیش لە پۆلی دووی سەرەتایی بوو. ڕاز و كانی لە پۆلی دوو و سێی ناوەندی بوون. ئەوەندە فریاكەوتین كتێبی پۆلی یەك و دووی سەرەتاییمان لەگەڵ خۆمان برد بۆ ڕەنج و سۆز.

نزیكەی سێ مانگ و نیو لە دوورگەی گوام ماینەوە لە كەمپدا بۆ ئەوەی دەزگای كۆچی ئەمەریكی INS كاروباری یاسایی خۆی تەواو بكات و لەو ماوەیەدا خوێندنی مەكتەب نەبوو بەڵكو بەردەوام دەوریان بۆ منداڵ و گەورە دەكردەوە بۆ فێربوونی ئینگلیزی و منداڵە وردەكان لەو ماوەیەدا گەلێ سرووودی ئەمەریكیش فێربوون كە بە كۆرس دەیانوتەوە.

ڕاستەوخۆ دوای نەورۆزی ١٩٩٧ چووینە ویلایەتە یەكگرتووەكان و وەك پێشتر لێیدواوم ئێمە بەر ویلایەتی جۆرجیا كەوتین لە باشووری ڕۆژهەڵات و لە شاری ڕۆزوێڵی نزیك گەورە شاری ئەتلەنتا نیشتەجێ بووین و لەو ماوەیەی كە تازە و ناشارەزا بووین گەلێ ژن و پیاوی خۆبەخش لە ئەندمانی كەنیسەی سانت دێڤیدی ئەو شارە هاتن بە دەممانەوە و هەریەكەیان خۆی بۆ كارێك تەرخان كرد لە گەڵمان. تاقمێكیان كاروباری شوقە گرتن و دابینكردنی ناوماڵیان گرتە ئەستۆ، دوو كەسیان مەسەلەی بازاڕ و بازاڕكردن كە هەفتانە بە ئۆتۆمبیلی خۆیان لەگەڵمان دەهاتن بۆ بازاڕی خواردەمەنی و هەفتانە بایی نزیكەی ٢٠٠ دۆلار پێداویستیی خواردنمان دەكڕی و تا سێ مانگ لەگەڵ كرێی شوقەكەدا هەر لە سەر حیسابی ئەوان بوو. بەمجۆرە بۆ ئەو دوو خێزانەی كەوتینە ئەوێوە هەر تاقمە و سەرقاڵی كارێكمان بوون. مەسەلەی خوێندنی منداڵەكانی من بە خاتوو میلۆدی ئەدنت سپێردرا، كە ژنێكی گەنج و ڕۆحسووك بوو، شووی كردبوو و تاقە یەك كچی دووساڵانی هەبوو ناوی چیلسی بوو و لەگەڵ مێردەكەیدا زۆر بەختەوەر بوو. میلۆدی مامۆستای زمانی ئینگلیزی بوو لە قوتابخانەیەكی ئامادەییدا و شانبەشانی ئەوەش خۆی ئامادە دەكرد بۆ وەرگرتنی دكتۆرا لە ئینگلیزیدا. منداڵەكانی قۆناخی سەرەتاییم بە پێی تەمەنیان و لە سەر ڕاوبۆچوونی خۆم لە پولی یەك و دووی سەرەتایی، لە قوتابخانەی مێمۆسا Memosa وەرگیران دەبوو بە پاسی مەكتەب هاتوچۆبكەن. دوانەكەی قۆناخی ناوەندیش دیسان بە پێی تەمەن و پاش تاقیكردنەوەیەكی سەرەتایی لە زمانی ئینگلیزی و چەند دەرسێكدا لە

پۆلی حەوت و هەشتی قوتابخانەی ناوەندیی ڕۆزوێل وەرگیران و هەر چواریان دەبوو لە پۆلەکانی ئینگلیزی وەك زمانی دووەم بخوێنن ESL. ئەم سیستەمە لە سەرانسەری ئەمەریکادا پەیرەوی دەکرێت بە حوکمی ئەوەی سالانە زیاد لە ٥٠ – ٦٠ هەزار کۆچبەری یاسایی ڕوودەکەنە ئەو وڵاتەو دوو ئەوەندەشی بە شێوەیەکی نایاسایی لە مەکسیك و وڵاتانی تری ئەمەریکای لاتینەوە دزە دەکەنە ئەو وڵاتەوە و بۆ منداڵی هەمووشیان دەبێ خوێندن دابین بکرێت. ڕاستێکەی میلۆدی هاتوچۆیەکی زۆری کرد لە گەڵمدا بۆ ڕایی کردنی کاروباری وەرگرتنی منداڵەکان و ئەڵبەتە کاری میلۆدی تەنها گەیاندن و چاوساغی بوو بۆ بەدواداچوونی مەسەلەکە، دەنا سیستەمی خوێندن خۆی بە شێوەیەکی ئاسایی ئەو کارەی ڕێکدەخست. گەلێ جار میلۆدی موجامەلەی دەکردم و دەیوت من لە سەر کولتووری ئیسلامی هەندێ شت دەزانم چونکە ژنە مامۆستایەکی سعوودیمان لە گەڵە و دەزانم ئێوە حەجتان هەیە و نوێژی جومعە دەکەن، وەك چۆن ئێمە ڕۆژانی یەکشەمە دەچینە کەنیسە بۆ نوێژ، ئەگەر دەتەوێ ڕۆژانی جومعە دێمە شوێنت و دەتبەم بۆ مزگەوتێکی گەورە لە ناوەڕاستی ئەتلەنتادا بۆ ئەوەی نوێژی جومعە بکەیت. منیش زۆرم سوپاس کرد و وتم پێویست بەو زحمەتە ناکات.

سیستەمی ئینگلیزی وەك زمانی دووەم، ئەوەیە کەوا خوێندکاری بیانی لە پاڵ خوێندنی ئاساییدا چەند کۆرسێکی ئینگلیزیی سادە وەردەگرن کە نزیك بێت لە بابەت و کەشوهەوای دەرسەکانیانەوە و مامۆستاکان هاوکاریان دەبن بۆ فێربوون و ڕاهاتن بە زمانی ئینگلیزیو وردە وردە تێکەڵی ئەمەریکییەکانیان دەکەن بۆ زیاتر فێربوونو ئاشنابوون بە زمانەکە و پاشان تا بەتەواویی قاڵ دەبن و گرفتی زمانیان نامێنێ. ئەڵبەتە منداڵ زوو فێردەبن و منداڵەکانی من چونکە هیچ کوردێك نەبوو لە دەورمان یەکەمجار زۆر زەحمەتیان چەشت. تەنانەت دوو وردەکەمان تا یەك دوو مانگ وەك کەڕولاڵ دەهاتن و دەچوونو هەر بە ئیشارەت و دەسگرۆیی مامۆستاکان کاریان مەیسەر دەبوو، کەچی پاش چەند مانگێك بوونە بولبول لە ئینگلیزیی ئەمریکیدا و گۆکردنیان ڕێك وەك ئەوان وابوو بگرە گاڵتەشیان بە ئینگلیزییەکەی من و گۆکردنم دەکرد و دەیانوت بابە تۆ وەك مەکسیکییەکان قسە دەکەیت. منداڵەکان هەرچواریان پاش ماوەی ئەو ساڵە تا مانگی شەشی کە کۆتایی وەرزی خوێندنە زۆر بە سەرکەوتوویی هەر یەکە و قۆناخی خۆی بڕی و هێند ئینگلیزییەکەیان باش بوو بۆ وەرزی خوێندنی داهاتووی ١٩٩٧ – ١٩٩٨ هەریەکەیان چووە پۆلی پێشتر و لە سیستەمی ئینگلیزی وەك زمانی دووەم دەرچوون و لەگەڵ ئەمەریکیەکان تێکەڵ بوون. ئەمە بۆ مەکسیکی و خەڵکی ئەمەریکای لاتینی

ئیسپانی زمان زۆر زەحمەت بوو فێری ئینگلیزی نەدەبوون چونکە هەموو لە گەڕەك و کارکردن و پۆلەکانی خوێندندا پێکەوەن و کەمتر تێکەڵی ئەمەریکی دەبوون.

یەکەمجار کە لەگەڵ میلۆدی ڕەنج و سۆزمان برد بۆ قوتابخانەی سەرەتایی مێمۆسا دەستەی ئیدارە و مامۆستاکان پێشوازییەکی گەرمیان لێکردین. مەکتەبی چی بە بینای جوان و قەشەنگ و باخچەی ڕەنگاوڕەنگیەوە بەهەشتێك بوو بۆ خۆی و زیاد لە هەزار منداڵی تێدابوو بەلام گوێت لە ورتەی کەس نەدەبوو. لە سیستەمی خوێندنی ئەوێدا بەڕێوەبەر، یەکەی ناونووس کردن، پاشان مامۆستای سەرپەرشتیاری پۆل و یارمەتیدەرەکەی کە دەکرێ بە ڕابەری پۆل ناوی ببەین و ئەو پۆلە سەرەکییە پێیدەوترێ هۆم ڕووم و لەوێوە بەرنامەی دابەشکردنی منداڵان دادڕێژرێ و بۆ هەر دەرسێك دەنێرران بۆ پۆلێك کە مامۆستای تایبەتی خۆی هەبوو، بەلام زۆربەی کاتیان لە هۆم ڕوومدا دەبوون و وای لێدەهات مامۆستای ڕابەر لە دایك زیاتر ئاشنای منداڵەکان و هەڵسوکەوتیان دەبوو. زۆربەی ئەو دەرسانەش کە دەیانخوێند لە هۆم ڕووم ەوە فێریان دەکرا پیشاندەدرا، هەر لەوێشەوە دەیانناردن بۆ ژووری ESL بۆ فێربوونی دەرسەکان بە ئینگلیزییەکی سانا و ساکار و چەند جارێك سەرم لە منداڵەکان دا لە قوتابخانەدا و ڕەنج کە پۆلی یەك بوو لەدایکی زیاتر دەنووسا بە میس لایەسەوە Miss Laias و ئەویش لە دایك زیاتر نازی دابوویە. بە هەمان شێوە سۆزیش ئەوەندە باسی میس ماکلاڤلنی Miss Mclavlin دەکرد ئەوەندە باسی دایکی نەدەکرد. ئەم دوو خانمە مامۆستای هۆم ڕوومیان بوون. کە یەکەمجار منداڵەکانمان بردە مەکتەب و بردنمانە ژووری ئینگلیزی وەك زمانی دووەم ESL تەماشام کرد بە زۆربەی زمانەکانی دنیا لە پارچە کاغەزی ڕەنگاوڕەنگی سەر دەرگاکەی نووسراوە: بە ئیسپانی، بە یابانی، بە ئەڵمانی بە کۆری، بە چینی، بە فارسی نووسرابوو "خۆش امدید" و بە عەرەبی"اهلاً وسهلاً". پێیان وتم تۆش بە زمانی خۆت بنووسە و منیش بە کوردی و بە خەتێکی گەورە نووسیم "بەخێربێن". ئەو ژوورە منداڵانی گەلێ شوێنی سەر زەوی تێدابوو بە ڕەنگ و ڕوخساری جۆراوجۆریانەوە.

مەکتەبی مێمۆسا وەك لای خۆمان دوو سێ دەوامی تێدا نەبوو بەڵکو منداڵەکان دەبوو پێش هەشتی بەیانی بگەیشتنایەتە ئەوێ و سەعات سێی پاش نیوەڕۆ دەهاتنەوە بۆ ماڵ. جا لەبەر ئەوەی شارەکانی ئەمەریکا وەك شاری لای خۆمان و بگرە ئەورووپاش بەرتەسك و ماڵ بە ماڵەوە نووساو نیە بەڵکو هەتا چاو بڕ بکات پانوپۆڕ و لەبەر زەوی زۆریی ئەو وڵاتە ڕووبەرێکی هێجگار بەرفراوانی گرتووەتەوە. لەبەر ئەوە دەزگایەکی تایبەتی سەر بە

بۆردی خوێندن ئـەرکی گواستنەوەی خوێندکاری لەئەستۆ گرتووە و پێیدەوترێ دەزگای گواستنەوە و دنیایەك پاسی هەیە و بە پێی نەخشەی شار بەیانیان زوو لە سەر شەقامە سەرەکییەکان منداڵان کۆدەکەنەوە و دوای نیوەڕوانیش دەیانهێننەوە هەمان شوێن. تۆ بە ڕێکی کاتی بەیانی و دوای نیوەڕۆی گەیشتنی ئەو پاسە دەزانی کە منداڵەکانی لێوە دەبا و دەیگێڕێتەوە. زۆربەی شۆفیری ئەم پاسانە ژنن و ڕەنگی پاسەکان نارنجییە و لووتێکی دریژیان هەیە و هەریەکە ٥٠ – ٦٠ منداڵ دەگرن و لەهەر شوێنێکی شەقامی شاردا خاوی بکەنەوە و بوەستن قۆڵێکی تەختەی یەك مەترییان لێوە دەردەپەڕێ و تەواوی هاتوچۆی ئۆتۆمبیلی هەردوو سایدەکەی شەقام دەوەستێ تا منداڵەکان دادەبەزن و دەپەڕنەوە. ئێمە گەلێ گرفتی هێنان و بردنی دوو منداڵە بچووکەکەمان تووش دەبوو بۆ شوێنی وەستانی پاسەکان. ماڵی ئێمە بە پێی منداڵ دە دوانزە دەقیقەیەك لە دەروازەی ئەو گەڕەکە شوقەیەوە کە تێیدا نیشتەجێبووین، لە سەرشەقامی سەرەکییەوە دوور بوو و نەدەکرا هیچ کاتێك منداڵەکانمان بە تەنها بچوونایەتە سەر جادەکە بۆ شوێنی وەستانی پاسی مەکتەب، لە ترسی منداڵ فڕاندن و تاوانی هەمەجۆری دیکە کە لەو وڵاتە پانوپۆڕ و تێکەڵ و پێکەڵەدا دەکرا. لەبەر ئەوە هەموو بەیانییەکی زوو سەعات شەش و نیو لەخەو هەڵدەستام وردە وردە تا منداڵ خۆیان کۆدەکردەوە دەچووە نزیکی حەوت و دەبوو سەعات ٧ ی بەیانی ئامادەبن و پاس دەهات دەیبردن. دوای نیوەڕۆش دەبوو دایکیان سەعات ٣ ی ڕێك لە هەمان شوێندا چاوەڕێ بکات و منداڵەکان وەربگرێتەوە و لەگەڵیان بگەڕێتەوە بۆ شوقەکە بۆ ئەوەی نە لە ڕێگا و نە لە ماڵدا تەنیا نەبن. لەبەر ئەوحاڵەتە دەبوو دایکیان پارت تایم کار بکات و ئەودوای کاتی لەگەڵ منداڵەکان بێت. گەلێ جار ڕەنج دوای دەوام لە کاتی دەرچوونی پاسەکاندا لە بەر یاریکردن سەرنجی نەدەدایە بانگەوازی پاسەکان و بەجێدەما و پاشان لە مەکتەبەوە تەلەفۆنیان بۆ دەکردین منداڵەکەتان جێماوە وەرن بیبەنەوە و دەبوو دەستمان لە ئیش هەڵبگرتایە و بچووینایە بە شوێن منداڵدا. من ڕۆحم لەوە ڕۆیشتبوو منداڵەکان ڕۆژێکیان پاسەکەیان لێتێکبچێت و سواری پاسی گەڕەکێکی تر ببن و بفەوتێن. چونکە هەر لە ئەتڵەنتا لەو دەمەدا خوشك و برایەکی منداڵ پاسەکەیان لێتێکچووبوو و ڕۆیشتبوونە گەڕەکێکی تر و بە هەڵە دابەزیبوون و لەوێ تاوانبارێکی نادیار سەری بڕیبوون. ئەو پاسەی منداڵەکانی منی دەگواستەوە ژمارەی ٣١٧ بوو، لە مەکتەب کاتی گەڕانەوە بەم جۆرە بانگەوازیان بۆ دەکرد: "براون باس، سری وان سێڤن brown bus three one seven ، واتە پاسی قاوەیی ژمارە (٣١٧)". منیش هەموو بەیانییەك کە لە ماڵەوە بە پێ دەمگەیاندنە وێستگەکە وەك ڕیکۆردەر ئەو ژمارەیەم دەدا بەگوێیاندا

"ڕەنج، سۆز: سری وان سێڤن بروان باس" ها لەبیرتان نەچێ، کەچی هەندێ جار یاریی لە بیری دەبردنەوە و بەجێدەمان و گیانیان دەگەیاندە کونەلووتی ئێمەش. منداڵەکان لە قوتابخانە نیوەڕوان ژەمێك خواردن و شیر و سووپی نایابیان دەدانێ، بۆ ئێمە کە پەنابەر بووین بە خۆڕایی بوو، بەلاّم بۆ ئەمەریکییەکان بە پارە بوو. هەموو هەفتەیەك لیستێکی ناوی خواردنەکەیان دەنارده ماڵەوە بۆ ئەوەی ئێمە ڕەزامەندیی خۆمان دەربڕین لە سەر خواردنی منداڵەکە و بۆ هەر ڕۆژەی سێ جۆر هەبوو یەکێکیان هەڵبژێرین و ئیمزای لە سەر بکەین. ئەڵبەتە ئێمەش بە خۆشحاڵییەوە ئیمزامان دەکرد و تەنها ئەو خواردنانەمان لێدەپەڕاند کە گۆشتی بەرازیان تێدابوو. بۆ هەر سەیران و گەشتێکی زانستی کە لە قوتابخانە دەرچوونایە دەبوو بەخێوکەری منداڵەکان مۆڵەتیان بدایە و ئیمزایان لە سەر فۆرمێکی تایبەتی بکردایە.

منداڵەکانی قۆناغی ناوەندیشم، وەك باسم کرد، لە پۆلی حەوت و هەشتی ناوەندیی ڕۆزوێلْ چوونە بەرخوێندن و ئەمانیش بەهەمان دەستووری منداڵە بچووکەکان کۆرسی خوێندنی ESL یان وەردەگرت بۆ قاڵبوون لە ئینگلیزیدا و بە چاکی دەچوونە پێشەوە و گەلێ سوودیان لە تێکەڵەی خوێندکارانی وڵاتگەلی هەمەجۆر وەردەگرت، کەوەك ئێمە کۆچبەر بوون. ئەوەی زۆر سەرنجی ڕادەکێشام کە منداڵەکانی قۆناخی ناوەندیم دەهاتنەوە سووردەبوونەوە و هەر پێکەنین دەیگرتن، لێمان پرسین مەسەلە چیە، بە پێکەنینەوە دەیانگوت بابە لە پۆلەکەدا کەس گوێ ناداتە ئەوەی بای لێ بەرببێتەوە و تەنانەت هەندێك لە مامۆستاکانیش لە کاتی دەرز وتنەوەدا شەق بایەکی زلیان لێ بەردەبێتەوە و تەنها دەڵێ ببوورە excuse me و مێشێکیش میوانیان نیە و ئیمە و قوتابییە مەکسیکییەکان زۆر بەمە پێدەکەنین و ئەوانیش گاڵتە بە پێکەنینی ئێمە دەکەن. بەهەر حاڵ پاش ماوەیەك منداڵەکانی منیش باسی ئەم بەزمەیان نەدەکرد و پێدەچێت ئەوانیش پێی ڕاهاتبێتن.

شیاوی باسە قوتابخانەکانی ئەوێ هەموو ساڵێ لە مانگی پێنجدا نمایشی وەرزشی بۆ هەموو پۆلەکان ڕێکدەخەن و قوتابیانی هەر وڵاتێك، لەو قوتابخانەیەدا بە ناوی وڵاتەکەی خۆیانەوە بەشداری دەکەن و کاتێ بە بەر سەکۆکەدا تێدەپەڕن، هەر وڵاتە و کورتەیەکی لەبارەوە باسدەکرێت. بۆ ئەم مەبەستە خاتوو میشێلی دۆستمان سەر و بلووزی بۆ منداڵەکان هێنا کەوا کوردستانی لە سەر نووسرابوو و سەر و ئاڵای کوردستانیشی بۆ دروستکردن و لەکاتی نمانیشەکەدا بەرزیان کردبۆوە و ئەو زانیاریەشیان دابووە پەخشکارەکە کە باسێکی کورتی کوردستان بکات و چۆن گرفتار بووە بە دەستی سەدام حوسێنەوە و ئەمانیش وەك کورد بۆچی ئاوارەی ئێرە بوون. بۆ ساڵی ئایندە ڕاز چووە

پۆلی هەشت لە ناوەندیی کراپ ئەپڵ Crab Apple هەر لە شاری ڕۆزویڵ و کانییش چووە پۆلی نۆ لە ئامادەیی ڕیڤەروود Riverwood High School. دەبێ ئەوە بڵێم کە ڕاز زۆر زیرەك و دەرکەوتوو بوو، مامۆستای هۆم ڕوومەکەی، واتە ڕابەرەکەی، کە ناوی میس ئەگنس گالیگۆسکی Miss Agnes Goligosky بوو زۆر جار سەردانی دەکردین یان تەلەفۆنی بۆ دەکردین و سەرسامیی خۆی لە ئاستی بەهرە و زیرەکیی ڕاز دەردەبڕی. ئەوانیتریشم باش بوون، بەلام نەدەگەیشتنە ئاستی ڕاز، کە لە کێبەرکێی خوێندندا ئەمەریکی و مەکسیکییەکانی بۆڕدابوو و تەنها کچێکی کۆریی کە ناوی کاتی بوو مونافەسەی دەکرد و لەو سۆنگەیەشەوە ڕاز دەیوت ڕقم لە چاو تەسکەکانە و تەنها ئەوان دەتوانن هاوشانم بن.
ڕاز بێجگە لە خوێندنی ئاسایی مەکتەب خولیای مۆسیقاشی هەبوو و کەمانێکی لە قوتابخانە خواستبوو و ڕاهێنانی لە سەر دەکرد و لە ڕووی هونەریشەوە کۆرسی موسیقای وەردەگرت. پاشان لە ئۆرکسترایەکی قوتابخانەکانی ئەو شارەدا بەشداری کرد و جێی ڕەزامەندی مامۆستاکانی بوو. لەوێ سیستەمێك هەیە کە لەدوای نیوەی ساڵەوە بۆ سێ مانگ هەر مانگە و یەکێك دەبێتە یەکەمی قوتابخانەکانی ئەو شارە، یان ئەو هەرێم و موقاتەعەیەی سەرجەمی شار و ناوچەکانی ئەمەریکای بە سەردا دابەشکراوە و پێیاندەوترێ کاونتی county و ئاهەنگێکی گەورەی بۆ سازدەکەن. شیاوی باسە وردەکاریی سیستەمی پەروەردە و فێرکردن لە کاونتییەکەوە بۆ یەکیکیتر جیاوازیی تێدایە. بۆ مانگی مارتی ساڵی ۱۹۹۸ ڕاز بە یەکەمی سەرجەمی قوتابخانەکانی هەرێمی فولتن Fulton county دەرچوو، کە بەشێکی گەورەی میترۆپۆلیتانی ئەتلەنتای دەگرتەوە و یانەی ڕۆتەریی ئەمەریکی - لقی ڕۆزویڵ American Rotary Club ئاهەنگێکی گەورەی بۆ سازکرد، کە نانخواردنیشی تێدا بوو و ئەمەریکی کەمتر ئەم جۆرە ئاهەنگانە سازدەدەن. یانەی ڕۆتەری، یانەیەکی کۆمەلایەتییە و ساڵی ۱۹۰۵ لە شاری شیکاگۆ دامەزراوە و ئێستا لقی لە زۆربەی شارەکانی ئەو ولاتەدا هەیە. لە ئاهەنگەکەدا چەند کۆنگرێسمانێك و پارێزگاری شار و بەڕێوەبەری پۆلیس و نزیکەی ۱۵۰ کەس ئامادەبوون و لە پێشدا خاتوو گالیگۆسکیی ڕابەری پۆلیان ڕازی بە ئامادەبووان ناساند کە منداڵێکی زیرەکی کوردە و ئاوارەی دەستی ڕژێمی عێراقە لەگەڵ خێزانەکەیدا و لێرە زۆر زوو فێری ئینگلیزی بووە و لە وانەکانیدا پێشکەوتووە و ئێستاش ڕاپۆرتێکی وردی لە سەر کۆمپانیای کۆکا کۆلای جیهانی ئامادەکردووە. پاشان بەڕێوەبەری قوتابخانەکە، خاتوو لیندا هۆپینگ Miss Linda Hopingو چەند کەسێکی تر وتاریان خوێندەوە و گەڵ لەو بەرپرسانە بە خۆشحاڵی و تەوازوعەوە دەهاتن بۆلام و پیرۆزباییان لێدەکردم کە منداڵی وا زیرەکم

هەیە و وێنەیان لەگەڵ دەگرتین و پاشان خەڵاتی پەنجا دۆلارو کۆمەڵێک دیارییان پێبەخشی.

ئەڵبەتە لێرە لێدانی منداڵ نەبوو لە هیچ قۆناخێکدا، بەڵام ئەگەر قوتابییەک لاساری یان هەڵەیەکی بکردایە سزاکەی ئەوە بوو کە دەبوو نانی نیوەڕۆی بە تەنها بخواردایە، واتە لە چێشتخانەی قوتابخانە خواردنەکەی وەربگرتایە و لە گەڵ منداڵەکانی تر لە هۆڵی چێشتخانەکە نەیخواردایە و بیبردایەتەوە بۆ پۆل و لەوێ بە تەنها و بێدەنگ بیخواردایە و بەمەشیان دەوت نانخواردنی بێدەنگ silent lunch، ئەگەریش سزاکە قورستر بوایە ئەوە پاش دەوامی ئاسایی سەعاتێک دەیانهێشتەوە و مامۆستاکەشی لە گەڵی دەمایەوە و بە پاسی مەکتەب نەدەڕۆیشتەوە و دەبوو باوك یان دایکی بهاتنایە بیانبردایەتەوە و بەمەش دەوترا حیجز کردن detention بە هیچ جۆرێك پەشیمان بوونەوە نەبوو لەم سزایە و دەبوو خوێندکار ملکەچی بوایە. بۆ هەندێ سزاش نامە بۆ باوك و دایك یان بەخێوکەر دەنێردرا بۆ ئەوەی پێکەوە لە گەڵ بەڕێوەبەرێتیی قوتابخانەدا کێشە و گرفتەکان چارەسەر بکەن. یەکێك لە گرفتە گەورەکانی قوتابخانە ئامادەییەکانی کچان مەسەلەی سکپڕییە کە لە هەندێ کچی ئەو قۆناخەی خوێندن دەقەومێ و ڕەوتی خوێندنیان تێکدەچێت، دەنا هاوڕێ گرتن و سێکس کردن لە دوای تەمەنی شانزە ساڵییەوە لەو وڵاتە ئاوخواردنەوەیە!

شیاوی باسە لێرە قوتابیانی هەموو قۆناخەکانی خوێندن، بە سەرەتاییشەوە، بەیانیان کاتژمێر هەشتی تەواو هەر پۆلە و لە ژووری خۆیان چەند دەقیقەیەك بە پێوە دەوەستن و دەستی ڕاستیان دەخەنە سەر دڵیان و ڕوو دەکەنە ئاڵای ئەمەریکا، کە لە هەموو ژوورێکدا هەیە و بە یەك دەنگ لە گەڵ ئەو بڵندگۆیەدا کە بۆ هەموو قوتابخانەی پەخش دەکات بەڵێن تازە دەکەنەوە و ئەمەی خوارەوە دەڵێنەوە:

"بەڵێن دەدەم دڵسۆز بم بۆ ئاڵای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و کۆمار کە پشت بە خوا یەك وڵاتە و دابەش نابێت. ئازادی و عەدالەتیش تێیدا بۆ هەمووانە".

بە ئینگلیزییەکەشی I pledge allegiance to the flag of the United States of America. and to the republic for which it stands, one nation, under God, indivisible, with liberty and justice for all.

# کـــوردێك لە وڵاتی هندییە سوورەکـانـدا

کاتێ کۆڵۆمبس هەرچی دەریا و زەریایە تەی کرد و لە ساڵی ١٤٩٢دا لەنگەری لەو کیشوەرە پانوپۆڕەدا گرت کە دواتر بە ئەمەریکا ناسرا هەروا چۆڵەوانی نەبوو، بەڵکو ئەمسەر تا ئەوسەر پڕبوو لە خەڵکێك کە ژیانێکی خێڵەکیی سادە دەژیان و بنەمای ئابوورییان ئاژەڵداری و ڕاوی گامێشە کێوی بوو، کە بە هەزارانیان لەو مێرگ و پێدەشتە بەرینانەدا دەلەوەڕان. ئەم خێلانە کۆلۆمبس بە هەڵە بە هندیی لە قەڵەمی دان بەو حیسابەی کە ئەم خاکەی پێی خستووەتە سەر بەشێکە لە هندستان. کەچی لەڕاستیدا ئەمانە خێڵی جیا و ناوی جیاجیان هەبوو، کە گەورەترین خێڵیان چیرۆکی Cherokee و بە دوای ئەودا ئەپاچێ Apache و کریك Creeck و چۆکتاو Chocktaw و چیکسا Chiska و چەندی تر بوون.

دیارە مێژووی دروستبوونی ئەمەریکا ڕوونە و کۆڵەکە هەرە بنەڕەتیەکەی کۆچی هەزاران خەڵکی سپیپێستی ئەوروپایە بە درێژایی چەندین سەدە و پاشان کۆچی هەزاران کەسی تری سەر زەوی بۆ ئەو وڵاتە و گەڕان بە دوای نان و ژیان تێیدا. بەشێکی بەرچاوی خەڵکەکەشی ئەو ڕەشپێستانەی ئەفریقا بوون کە وەك کۆیلە بۆی گوێزرانەوە پاش ڕاوکردنیان لە کیشوەری ڕەشدا و ڕاپێچکردنیان بۆ ئەم کیشوەرە نوێیە لە پرۆسەی بازرگانییەکی بەدناودا کە بەبازرگانیی کۆیلە ناسرا لە مێژوودا.

من ناڵێم شارستانی بنیات نەنراوە لەم خاکە پانوپۆڕەدا، وەلێ ئەوە دەڵێم کە ئەم شارستانییە لە سەر حیسابی قڕکردنی میللەتێك دروستکرا کە خەڵکی ڕەسەنی ئەو وڵاتە بوون و چەندین هەزار ساڵ بوو لەو وڵاتەی خۆیاندا ئەو ژیانە سوننەتی و ساکارە دەژیان و زیانیشیان بۆ کەس نەبوو. ئەم میللەتەش خێڵەکانی هندییە سوورەکان بوون کە بە دەردێك بران تائێستاش بە نەنگی دەژمێردرێ لە مێژووی ئەمەریکادا. سپیپێستەکانی ئەوروپا خۆیان لە تاو زوڵم و ستەمی کەنیسە و دادگاکانی پشکنین و توندوتیژی ڕەویان کرد بۆ ئەمەریکا کەچی لەوێ کەوتنە تەنگ پێهەڵچنین و پاشان قڕکردنی خەڵکی ڕەسەنی وڵاتەکە و بەدرێژایی چەندین سەدە هەرچی تەفرەدان و فرتوفێڵ و ساختە بوو لە گەڵیاندا کردیان و ئەنجام بە قڕکردنیان شکایەوە لە پرۆسەیەکی جینۆسایدیی کەموێنە لە مێژوودا. بەرچاوترین خاڵی ئەو قڕکردنە ئەوەیە کە لە مێژووی ئەمەریکادا بە کاروانی فرمێسك دەناسرێ Trial of Tears و تێیدا هەزارانیان لێ قەتڵوعام کردن. هەموو تاوانی ئەمانەش تەنها ئەوەبوو کەوا خاکەکەیان بە پیتە و دنیایەك کانە ئاڵتوونی تێدا

دۆزرایەوە و ئەمە سەری خواردن وەك چۆن نەوت لە خاکی کوردانـدا خەریکە سەریان دەخوات.

خۆ وەنەبێ ئەم خێڵانە هەروا بە ئاسانی ملیان بۆ چەقۆی قەسابی سپیپێست درێژ کردبێت و لە بەرانبەریاندا دەستەوسان بووبێتن، بەڵکو مێژووی بەرەنگاری و ململانێیان پڕە لە فیداکاری و خەبات و خۆبەختکردن لە پێناوی ژیان و مانیاندا و بە درێژایی مێژووی ئەو ململانێیە بە سەدانیان لەو سپیپێستانە قەڵاچۆکرد، بەڵام دواتر بە شیر و تیر و ڕم هیچ نەکرا لەگەڵ چەك و تەکنیکی سەربازیی پێشکەوتوودا.

قەدەر وایهێنا کە من لە ئەمەریکادا بکەومە ئەو شوێنەی کەوا سەردەمانێکی دوورودرێژ قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی گەلی چیرۆکی بێت و لەو شارەدا نیشتەجێ بم کە دەکەوتە نزیك شوێنێکەوە پێشتر نیو ئیکۆتای ناو بووە New Echota ماوەیەکی زۆریش پایتەختی بەڕێوەبردنی کاروباری ئەو گەلە بوو. شارەکە ناوی ڕۆزویڵ بوو و دەکەوتە سەر بەشی باکووری ڕووباری چاراهووچی Chattahoochee، کە بە زمانی هندییە سوورەکان یان ڕاستتر بڵێم بە زمانی گەلی چیرۆکی مانای "بەردی زەرد" دەگەیەنێت. ئەم ڕووبارە لە دامێنی چیاکانی ئەپەلاشیاوە سەرچاوە دەگرێ و بە سەر ویلایەتەکانی کارۆلینای باکوور و جۆرجیا و ئەلەبامادا تێدەپەڕێ و دەڕژێتە کەنداوی مەکسیکەوە. ئەم ناوچەیە ڕۆژگارێك چیرۆکی ناویان نابوو "خاکی دڵگیر". بە پێی قانوون نەدەبوو سپیپێستەکان بچنە ناو خاکی چیرۆکییەوە، بەڵام بە زۆریی ئەمەیان پشتگوێ دەخرا. پایتەختی چیرۆکی لە نیو ئێکۆتا کێشەی بۆ ویلایەتی جۆرجیا دروستکردووە بە هۆی ڕێکەوتننامەی ساڵی ١٨٠٢ دوە لە گەڵ حکومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکاندا بۆ ڕاماڵین و دەرپەڕاندنی چیرۆکییەکان لەو سنوورەدا. ناوی ئەم شارەی ئێستا دەگرێتەوە بۆ ڕۆزویڵ کینگ، کە دەوڵەمەندێکی ناوچەکە بووە و ساڵی ١٨٣٨ یەکەم کارگەی لۆکەی لێرە دامەزراندووە و ماڵی کرێکاری کارگەکە و بازرگانی تری تێهاتووە و وردە وردە خانوبەرە، کەنیسە، بازاڕ و قوتابخانەی تێدا کراوەتەوە و گەشەی کردووە.

کاتی خۆی و لە ساڵی ١٥٤٠ بەملاوە وڵاتی چیرۆکی لە ڕووباری ئۆهایۆوە لە باکوور درێژدەبۆوە تا ئەم ڕووبارەی چاراهووچی، کە ئێستا لە ویلایەتی جۆرجیایە لە باشوور و تەواوی دۆڵی تەنەسی و زنجیرە چیای سمۆکیی گەورە و هەردوو ویلایەتی کارۆلینای باکوور و باشووری ئەمڕۆی دەگرتەوە. ئەم گەورە خێڵەی چیرۆکی بەردەوام لە شەڕدا بوون لە گەڵ خێڵە هندییەکانی تری دەوروبەریاندا، وەك کریك و چۆکتاو. هەروەها لە ململانێی ئینگلیزو فەرەنسیەکاندا دابوویانە پاڵ ئینگلیز و ساڵی ١٨١٢ ش دایانە پاڵ ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ژێر ئاڵای ئەندرو جاکسۆن Andrew Jacksonدا و ئەگەر ئەمان

نەبوونایە ئەوە تۆماهووکێکی خێڵی کریك سەری جاکسۆنی لەت دەکرد (تۆماهووك چەکێکی کۆنی کاریگەری هندییە سوورەکان بوو لە شێوەی پاچێکی زل و قەبەدا و ئێستا بووە بە ناوی مووشەکێکی پێشکەوتووی ئەمەریکا). کەچی هەر ئەم جاکسۆنە پاش ئەوەی ساڵی ١٨٣٠ بوو بە سەرۆکی حەوتەمی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا پشتی تێکردن و بە دەردێکی زۆر خراپی بردن.

سپیپێستەکان بە زۆریی لە کەنار دەریای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای کیشوەری بەرینی ئەمەریکادا هەواریان دەخست و شاریان دروست دەکرد و ئیتر تا سەد و پەنجا ساڵێکیش پێش ئێستا شوێنەکانی ناوەوە بە زۆری کەس پەی پێ نەدەبرد و زیاتر خێڵە هندییەکانی تێدا دەژیا، ئەگەرچی ڕاوکردن و قڕتێخستنیان هەر بەردەوام بوو و کە شەپۆلی کۆچی سپیپێست زیادی دەکرد فشاری زیاتر دەکەوتە سەر ئەمان. مۆرکی ویلایەتەکانی کەنار زەریانی ڕۆژئاوا زیاتر ئیسپانی و پورتوگالی بوو چونکە ماوەیەکی زۆر کۆڵۆنیی ئەم دوو دەوڵەتە بوون، بەڵام ویلایەتەکانی کەناری ئەتڵەنتیك زیاتر مۆرکی ئینگلیز و فەرەنسای پێوە دیار بوو. ئەڵبەتە سیانزە ویلایەتەکەش کە ناوکی پێکهێنانی ویلایەتە یەکگرتووەکان بوو لە کەناری ئۆقیانووسی ئەتڵەنتیکەوە دەستی پێکرد و پاشان بەرە بەرە ناوچە و هەرێمی تری ئەمەریکا بوون بە ویلایەت و خرانە سەر ئەمانی تر.

ئەو ساڵانە ئێمە لە ڕۆزوێڵی نیشتەجێ دێرینەکەی خێڵی چیرۆکی نیشتەجێ بووین، هیچ ئاسەوارێکی ئەوتۆی ئەو گەلەی تێدا نەمابوو، تەنها ناوی ڕووباری چارا هووچی وەك خۆی مابۆوە و لە سەر ئەو ڕووبارەش بوارێك هەبوو لە زەمانی پێش تەکنیکی پرد دروستکردندا خەڵك لێی پەڕیونەتەوە و ئەمەش بە ناوی ویلیۆی ناوداری ئەو خێڵەوە بووە و تائێستاش ئەو ناوە ماوە. بەنکێك هەیە بە ناوی ئێتاوا واتە بورجی بەرز بەو زمانە چێشتخانەیەکیش بە ناوی چیرۆکییەوە. لە کتێبخانەکانیشدا گەلێ سەرچاوەی هەمەجۆر هەن لە بارەی فۆلکلۆرو ئەفسانە و مێژووی ئەو گەلەوە. هەروەها ئەوەی سەرەنج دەدرێ تائێستا گەلێ ناوی شوێن و شار و شاخ و هەر پاشماوەی سەردەمی هندییە سوورەکانن و سەرباری تواندنەوە و قڕکردنیان وەك تەعریبەکەی لای خۆمانی پێ نەکرا. گەلێ ناوی دیاری وەك ویلایەتی تەنەسی Tennessee و شاری چەتەنووگا Chattanooga و شاری تەلەهاسی Talahassee هەروەك خۆیان ماونەتەوە و دەسکاری نەکراون.

تا ساڵانی بیستەکانی سەدەی نۆزدەش چیرۆکی لەو وڵاتەی خۆیدا کە پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد هەرچۆنێك بوو گوزەرانیان دەکرد و خەریکی ئاژەڵداری و کشتوکاڵ بوون بەتایبەتی چاندنی گەنمەشامی و ڕاوکردن بوون و کەمتر سپیپێست فشاری بۆ دەهێنان. بەڵام لەو دەمە بەدواوە بەڵاو نەگبەتییەکی نوێ ڕووی تێکردن و ساڵی ١٨٢٨ ئالتوون لە

خاکەکەیاندا دۆزرایەوە. ئەو شوێنەی کە کانە ئالتوونەکەی لێدۆزرابووەوە ناوی دەهلۆنیگا Dahlonega بوو، کە نزیکەی سەعاتێکی سەیارە لە ئێمەوە دوور بوو.

ئەم دەهلۆنیگایە (کە ناوەکەشی هەر هی ئەو زەمانەیە) ئێستا شارێکە و دەکەوێتە لای باکووری دەریاچەیەکەوە پێیدەوترێ لێنیر Lake Leneir کە ئێستا سەیرانگایە و جارێکیان منداڵەکانی منیش لە گەشتی وەرزی هاوینی مەکتەبەکەیاندا برابوونە شوێنی ئەو کانە ئاڵتوونە و لە کەناری دەریاچەکە لیان پێ بێژابوونەوە و بە ئەندازەی دەنکە لێکی بچووك ئاڵتوونیان دۆزیبۆوە و وەك یادگار لە شووشەیەکی بچووکی ئاودا هەڵیانگرتبوو. ئەڵبەتە ئەو کانە ئیستا لە ڕووی ئابوورییەوە بایەخێکی نەماوە و لەو دەمەوە هەموو ئاڵتوونەکەیان دەرهێناوە و ئێستا تەنها وەك شوێنێکی گەشتوگوزاری مێژوویی تەماشا دەکرێت.

ئەو دەمە کە هەواڵی دۆزینەوەی ئاڵتوون لەو شوێنەدا بڵاوبووەوە ئیتر خەڵکی سپیپێست بەلێشاو ڕوویانکردە ولاتی چیرۆکی و بە زۆر و بە خوایشت جێی خۆیان دەکردەوە و زەویوزاریان دەکڕی و زیاتر تەنگیان بە خێڵە هندییەکان هەڵدەچنی. من لە کتێبێکی مێژووی ڕۆژوێڵدا خوێندمەوە کەوا سپیپێستەکان لە هەموو لایەکەوە بە پاپۆڕ لە کەناری باشووری ڕۆژهەلاتەوە لە ویلایەتی جۆرجیا و بە تایبەتی لە بەندەری سەڤانا Savana لەنگەریان دەگرت و لەوێوە دەهاتنە شاری ئەتلەنتا و پاشان هەنگاو بە هەنگاو بەرەو ژوور دەبوونەوە و دەبوو لەم گەشتەیاندا لە ڕووباری چارا هووچی بپەڕنەوە و پەڕاندنەوەی عەرەبانەو هێسترو ئاژەڵو ڕەشەولاخ و ماڵی ئەم کۆچبەرانە بوو بە بازرگانییەکی باش بۆ ئەو کەسانەی ئاش و بواریان هەبوو لە سەر ئەو ڕووبارە و چەند قات زیادی کردبوو. ئەڵبەتە ئەو خەڵکەی دەڕژانە ئەوێ هەر تەنها بۆ ئەو کانە نەدەچوون بەڵکو بە نیازی کانی تر بوون و هەروەها تەماحیان کردبووە زەوی وزاری بەپیتیشیان.

ساڵی ١٨٣٠ وەك پێشتر باسم کرد ئەندرو جاکسۆن بوو بە سەرۆکی ئەمەریکا و پشتگیریی سپیپێستەکانی کرد و خێڵە هندییەکانی ناچاری کۆچکردن کرد بەرەو ڕۆژئاوا و مەسەلەکەیان لە سەر کردن بە یاسا و چەکدار و سەرباز دەیانگرتن و ڕاپێچی ئۆردووگای تایبەتیان دەکردن و لەوێشەوە لە ڕێگای ئاوی ڕووبار و وشکاییەوە بە ڕێگایەکی دوورودرێژی نزیکەی هەزار و پێنجسەد کیلۆمەتردا ڕەوانەی هەرێمی ئۆکلاهۆمایان کردن.
ئەم کارەساتە لە ساڵانی ١٨٣٨ – ١٨٣٩ دا بەرپاکرا و نزیکەی پانزە هەزار کەسیان گرت و بە پیادەڕۆیی ناچاری ئەو گەشتە دوورەیان کردن و دوا تاقمی ئاوارەکان لە ساڵی ١٨٣٩ دا گەیشتنە ئۆکلاهۆما و نزیکەی چوار هەزاریان لە ڕێگا گیانیان لەدەستدا، کە زۆربەیان

ژن و منداڵ بوون و بەدرێژایی ئەو ڕێگا دووره زنجیرەیەك گۆڕ بەمبەرو بەوبەریدا تەرمی ئەو خەڵکە کارەساتبارەیان شاردەوە و شایەتی زوڵمێکی سامناکە لە مێژوودا. ئەم ڕێڕەوە بە کاروانی فرمێسك Trial of Tears ناودەبرێ لە مێژوودا. ئەوانەی کە لە دەست مەرگ ڕزگاریان بوو لە ئۆکلاهۆما نیشتەجێبوون و بە کاری ئاژەڵداری و کشتوکاڵەوە خەریك بوون بەڵام دواترلێرەش نەیانهێشت بە ئاسوودەیی دانیشن و دیسانەوە زەوی و زاریان لێداگیرکردنەوە و هەرچی گامێشە کێوی بوو قڕیان کردن چونکە سەرچاوەیەکی سەرەکیی خۆراکی ئەم خێڵانە بوون.

لە کارەساتی قڕکردن و پەرتەوازە کردنی چیرۆکیدا نزیکەی هەزار کەسێکیان بەختیان هێنا و لە ڕاپێچکرنەکە دەربازبوون بە هۆی خۆشاردنەوە یان لێبووردنی تایبەتی و دایانە چیاکانی سمۆکی گەورەدا و Great Smokies بوون بە بناغەی باندی ڕۆژهەلات. ئێستا لە پاش زیاد لە ١٦٠ ساڵ نەوەی ئەوانە لە ویلایەتی کارۆلینای باکوور قەدەغەیەکیان (محمية Reservation) بۆ کراوەتەوە و تێیدا ژیانی نەریتپارێزی و خێڵەکیی خۆیان دەبەنەسەر و تێکەڵی خەڵکی تر نابن و ئێستا لە سەرانسەری ئەو وڵاتەدا ژیانی ئەو خەڵکە ڕەسەنە هاتووەتە سەر ئەوەی لە چەند قەدەغەیەکی تایبەتدا گوزەران بکەن و تا ئێستاش داب و دەستووری خێڵەکیی خۆیان پاراستووە. دەڵێن گوایە نوێنەریشیان لە کۆنگرێسدا هەیە.

سەیر ئەوەیە ئەم خێڵە ڕەسەنە بە ناو هیندییانەی کیشوەری ئەمەریکای باشوور و ناوڕاست و مەکسیك بەو دەردە نەچوون وەك ویلایەتە یەکگرتووەکان و ئەو وڵاتانەی لە سەرەتاوە بوون بە ژێردەستەی پورتوگاڵ و ئیسپانیا ئاوێتەبوونێکی بەرچاو لە نێوان خەڵکە ئەوروپایی و خێڵە ڕەسەنەکاندا دروستبوو، بە جۆرێك واهەست دەکەیت خەڵکە ڕەسەنەکە بارودۆخیان لە ژیانی ساکار و سەرەتاییەوە بەردو شارستانییەت پەرەی سەند و فەرهەنگ و کولتوور و زمانی ئیسپانی بالادەست بوو تێیاندا و زیاتر ئامێزی بۆ ئەو ئاوێتەبوونە کردەوە.

جارێکیان لە گوام مامۆستایەکی زانکۆ موحازەرەیەکی پێدایەن لە سەر پێکهاتە و مێژووی ئەمەریکا و زۆر ڕاشکاوانە پێی لێنا و وتی: "نەنگترین و شەرمەزارترین مێژوومان هەیە لە بواری مامەڵە کردنمان لە گەڵ خێڵە ڕەسەنەکانی ئەمەریکادا"!

# مەرگێکی پڕ تراجیدیا لە ئەمەریکا

مام ئەحمەد و ئایشێ خان وەك دەیان و سەدان کەسوکاری ئەو کوردانەی ساڵی ١٩٩٦ ڕەوانەی ئەمەریکا کران، کەوتنە تەك ماڵی کاك شیروان و کاك بەرزانی کوڕیان و ماڵی کاك هوشیاری زاوایان. کارەکە بۆ ئەوان هەندێك لەبارتر بوو لەچاو خەڵکی تردا، چونکە لەگەڵ کوڕ و کچ و زاوا و کۆمەڵێك کوڕەزا و کچەزایاندا دەژیان و بێجگە لەوەش ماڵی کوڕ و کچێکی تریان لە نەرویج بوو و هاتوچۆکرنیان بۆ لای یەکتر تاڕادەیەك ئاسان بوو. ئێمەش لەگەڵ ئەوان یەکماڵ بووین و کاك شیروان هاوڕێی سەردەمی زانکۆمە و لە وڵاتی خۆمان و لەوێش ئەندازیارێکی سەرکەوتووبوو. ئەم پیاوە بە شایەتیی هەموو برادەرەکانی کەسێکی تا بڵێی ڕاستگۆ و بەئەمەك بوو لە دۆستایەتیدا و بەش بەحاڵی منیش گەلێ هەڵوێستی مەردانەی هەبوو لە ژیانمدا و پەیوەندیی دۆستانەمان لەئاستێکدایە کورد واتەنی مەگەر هەر حەڵاڵمان لێکجیابێت.

کاتێ لە گوامەوە گوێزراینەوە بۆ ئەمەریکا مەسەلەکە وا کەوتەوە کە ئێمە و ماڵی کاك شیروان و خزمەکانی بەر ویلایەتی جۆرجیا و گەورە شاری ئەتڵەنتا بکەوین. ئەڵبەتە ئەمە هەر بەڕێکەوت نەبوو، بەڵکو لە کاتی پرۆسێسەکردنی ئەوراق و مامەڵەماندا ناوی یەکترمان لە فۆرمەکانماندا نووسیبوو. پاشان ئێمە بەر باکووری ئەتڵەنتا و شارۆچکەی ڕۆزوێڵ کەوتین بۆ نیشتەجێبوون و کارکردن، ئەوانیش هەموو پێکەوە بەر باشووری ئەو شارە کەوتن و لە ناوچەی جۆنسبۆرۆ نیشتەجێبوون و پاش بەینێکیش ماڵی کاك جەمال لە شاری چەتەنووگای ویلایەتی تەنەسییەوە، کە دوو سەعاتێك بە ئۆتۆمبیل دوور بوون، باریانکرد و هاتنە لای ئەوان و لە گەڵ ماڵی کاك بەختیاری برادەرماندا گرووپێکی چوار پێنج ماڵییان لە جۆنسبۆرۆ دروستکرد. لە ناوچە یان گەڕەکەکانی کلارکستۆن و دۆرەڤیل و شوێنی تری ئەو شارە گرووپی چەند ماڵیی کورد هەبوون، بەڵام زۆر پەرت و بڵاو، چەشنی گاڵی ناو دڕك.

جۆنسبۆرۆ نزیکەی سەعاتێك بە ئۆتۆمبیل لە ئێمەوە دوور بوو، بەڵام ناوبەناو لەگەڵ ماڵی کاك شیروان هاتوچۆی یەکترمان دەکرد و ئەڵبەتە باوك و دایکیشی کە لەو غەریبستانە تاڵەدا زۆر دڵمان بە یەکتر دەکرایەوە و پێکەوە گەلێ شوێنی خۆشی ئەو شارە دەچووین، بەڵام گەواڵە هەوری غوربەت هەردەم بە ڕاسەرمانەوە بوو و لە خۆشترین

شـوێنی ئـەوێدا ناخۆشـترین شـوێنی وڵاتـی خۆمانمـان بیردەکەوتـەوەوە و خۆزگـەمان پێدەخواست.

مام ئەحمەد هەرچەندە ژن و کـوڕ و کچی لـەدەور بـوون و لـە بـەر ئـەوەی تەمـەنی ٦٩ ساڵ بوو مووچەیەکی خانەنشینیی مامناوەندیی بۆ بڕابووەوە و بـەرزانی کوڕی، کە ئـەو دەمە ژنی نەهێنابوو و لەگـەڵ بـاوك و دایکی پێکەوە دەژیـان، درێغیـی لێنـەدەکردن و بـۆ گەڵ شوێنی دەبردن، کـەچی ئـەم پیاوە لـەوێ ڕانـەهات و هـەردەم دڵـەودوابوو و هەسـتت دەکـرد خـەم و خەفـەتێکی قـووڵ سـەری تێکردبـوو، بـەڵام کـەم دەریدەبـڕی و هـەردەم دەیچەپاندە دڵی خۆی.

زسـتانی ساڵی ١٩٩٨ بوو، کـە ئێمـە سـەردانمان کـردن و بـێ ئێـوە نـاخۆش ئایشـێ خـان کفتەیـەکی کوردانـەی بـۆ لێنـابووین و پـاش گەڕانـەوەمان بـە چـەند ڕۆژێـك هـەواڵێکی کتوپـڕ و دڵتـەزێنمان پێگەیشت کـە مـام ئەحمـەد تووشـی جەڵتـەی مێشـك بـووە و لـە نەخۆشـخانە کـەوتووە. یەکـەمجار کـە بردوویانەتـە نەخۆشـخانە دوکتۆرێکـی ڤێتنـامی بینیوێتی و پەی بە دەردەکەی نەبردووە و هەندێ حـەبی سەرئێشـەی ئاسایی داوەتـێ. بـۆ جاری دووەم کە لێیدایەوە بە پەلە گەیەنرایە نەخۆشخانە و ئەمجارەیان زانرا کە جەڵتـەی مێشکە و لەوێ ماوەی هەژدە ڕۆژ بە نیوەهۆش و بێهۆشی مایەوە و هەوڵێکی زۆری لەگـەڵ درا بەڵام هیچ کەڵکێکی نەبوو بەڵکو هەموو تـەکنیکی پزیشکیی ئەمـەریکا و پێشکەوتنی هەر توانی ١٨ ڕۆژ بیهێڵێتەوە و دوای ئەوە گیانی سپارد.

تا ئێرە ئاساییە و ئەوەی بێتە دنیاوە دەشمرێ، بەڵام سەختیی مەسەلەکە لای ئێمە ئەو غوربـەت و تەنهاییـە بـوو لـەو لێقەومانـەدا. چۆنـی وەربگرینـەوە و چۆنـی بەڕێبخـەین و چۆنی بنێژین و لە کوێ!؟.. لەوێ دەستوور وابـوو کـە جـەنازە لـە نەخۆشـخانە ڕاسـتەوخۆ نەدرێتـەوە بـە کەسوکاری مردووەکـە، بـەڵکو بـە ئۆتۆمبیلێکی داخـراو دەگوێزرێتـەوە بـۆ گۆڕسـتان. ئەڵبەتـە بـۆ خـەڵکی مەسـیحی بـەو ئۆتۆمبیلـە دەگوێزرێتـەوە بـۆ کەنیسـە یـان شـوێنێکی تایبـەت بـۆ سـازکردنی ڕێوڕەسمـی جـەنازە و پاشـانیش هـەر بـەو ئۆتۆمبیلـە دەگوێزرێتەوە بۆ گۆڕستان. بۆ ئەم حاڵەتەی ئێمـە کەنیسـەیەکی باپتیست دەسـتی هێنایـە پێشـەوە کـە ئـەرك و مەسـرە فـی بەخاکسپاردن بگرێتـە خـۆی، بـەڵام کەسـوکار ئـەوەیان ڕەتکردەوە و سوپاسیان کردن و پێیان وتن کە ڕێوڕەسمی ئیسلامی دەینێژن. جەنازەکـەمان وەرگرت و لە شوێنێکی تایبەتی نەخۆشـخانەکەدا ڕێوڕەسمـی شوشـتنی بـۆ ڕێکخـرا. ناردیـان شێخێکی مەغریبیی بەساڵداچووی ڕیشدرێژ هات و جەنازەمان بردە سەر ناتەشۆر و مـن و

کاك هوشیاری زاوایان بووین بە شاگردی شێخە مەغریبییەکە و ئاومان دەکرد بە مەیتەکەدا و ئەویش بە دەم خوێندنی چەند ئایەتێکی قورئانەوە دەیشۆرد و نەیدەهێشت بە موو دەستووره ئیسلامییەکە کەلیی تێبکەوێت. پێش ئەوەی من و کاك هوشیار بچینە ژوورەوە شێخەکە سوێندی داین کە هەر عەیبێکمان لە جەستەی مردووەکەدا بینی نابێ لای کەس و تەنانەت خێزانیشمان باسی بکەین. لە پاش شۆردنەکە شێخ فەرمانی دا بۆنی بۆ بێنین و بەرزان خێرا چوو بۆنێکی گرانبەهای هێنا بەلاّم شێخ قوبوولّی نەکرد و وتی: ئەمە مادەی ئەلکوولی تێدایە و دەبێ بۆنێك بێت هیچ ئەلکوولێکی تێدا نەبێت. پاشان ماددەی کافووری پێوەکرد و کفنی کرد و لە تابووتێکی داخراوی ناو بە هەمان ئۆتۆمبیلە قەپاتەکە بردمان بۆ مزگەوتێکی گەورە لە ناو ئەتلّەنتادا، بۆ ئەوەی نوێژی مردووی لە سەربکرێت. هێندەم زانی مەلای مزگەوتەکە و ٢٠ – ٣٠ کەسی ڕەنگ و ڕەگەز جیاواز، کە زۆریان ڕەشپێست بوون، هاتن نوێژی مردوویان لە سەر جەنازەکە کرد. شایانی باسە ئەم مزگەوتە نزیکەی ٢٥ ساڵ لەوەوبەر دوو برای پاکستانی بە پیتاك کۆکردنەوە دروستیان کردبوو و فێرگەیەکی قورئانیش تێدابوو، کە هەردوك مزگەوت و قوتابخانەکەش ناوی فارووق بوو.

لە باشووری شاری ئەتلّەنتادا و لە شوێنێکی نزیك جۆنسبۆرۆ گۆڕستانێکی موسڵمان هەبوو، ڕووبەرەکەی نزیکەی پێنج دۆنم دەبوو، دەیانگوت پیاوێکی سعوودی بۆ خێر کڕیوێتی و نزیکەی دووسەد گۆڕێکی تێدابوو لە عەرەب و هندی و پاکستانی و بەوەی ئێمەشەوە کوردێکی چووە سەر.

ئەوەی کە مایەی داخ و پەژارەیەکی زۆر بوو بۆ ئێمە هەر چوار پێنج کەسێك و کوڕەکانی و زاواکەی و لەگەڵ خێزانمان ٨ – ٩ کەسێك دەبووین شوێن جەنازەکە کەوتبووین و بە ڕێگاوە بۆ ئەو گۆڕستانە من خەیاڵم فڕیبوو بۆ لای خۆمان کە کەسێك بەردو گۆڕستان بەڕێدەخرێت دەیان و سەدان کەس شوێنی دەکەون، کەچی ئێمە لەم غوربەتە تاڵەدا هەر ئەم چوار پێنج کەسەی خۆمانین و کەسمان لە دەور نیە و ئەو ئەمەریکیانەی دۆستمان بوون ئەمە لە فەرهەنگیاندا نیە و دۆستە کوردەکانی ئەمەریکاشمان هەر یەکە لە بنی دنیایەك بوو بۆخۆی لەو وڵاتە پانوپۆڕەدا، کە لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوای شەش سەعاتی فڕۆکەی دەخایاند و سێ سەعات کاتیش هەبوو، واتە ئەگەر لە ئەتلّەنتا سەعات ١١ ی بەیانی بوایە ئەوە لە کالیفۆرنیا تازە کاتژمێر هەشتی بەیانی بوو. لە باکوورەوە بۆ باشووریش چوار سەعاتی فڕۆکەی دەبرد. ئەو کوردانەی لە

گەڕەك و ناوچە جۆراوجۆرەکانی ئەتلەنتا بوون و ئەوانەشیان کە دۆست و ناسیاو بوون هێندە دوور و پابەندی کارەکانیان بوون بەئاسانی نەدەگەیشتنە لای ئێمەو ئەگەر بیشگەیشتنایە هەروا ئاسان نەبوو کار بەجێبێڵن.

لە گۆڕستانەکە تەرمەکەمان لە ئۆتۆمبیلە داخراوەکە وەرگرت و شۆفێرەکەی لەوێ مایەوە و وەستا تا بەخاکمان سپارد و خاوەنی مردوو کاغەزێکی بۆ ئیمزا کرد ئەوجا ڕۆیشت. ئێمە زۆر سەرمان لەم کارە سوڕما و لە هەندێ خەڵکی ئەمەریکیمان پرسی بۆچی وا بەتوندی لەم کارە دەپێچنەوە و وەڵام ئەوەبوو لەوانەیە هەندێ کەس مردووی خۆیان وەربگرنەوە و تاقەت و توانای دابینکردنی ڕێوڕەسم و خەرجی ناشتنیان نەبێت و لە شوێنێکی چۆڵاییدا بیخەنە چاڵێك یان شیویکەوە و بڕۆن و ئەمەش ژینگە پیس دەکات. جا لەڕاستیدا ئەرکی مردوو ناشتن لەو وڵاتە قورسە و ئەوەی ئێمە زیاد لە دوو هەزار دۆلاری تێچوو کەوا کاك شیروان و کاك هوشیار و بەرزان خۆیان دابینیان کرد و قبووڵیان نەکرد کەس هاوکارییان بکات. لە گۆڕستانەکە نەریت وابوو هەر بستێك لە زەوی بەرزبێتەوە و تاقە یەك کێلیش لە ژوورسەری بێت، کە بەزۆری پارچە مەرمەڕێکە و ناو و تەمەنی کەسی کۆچکردووی لە سەرە. ئەڵبەتە هەڵبەستنی گۆڕ لە گۆڕستانی مەسیحیەکانیشدا هەر کێلێکی مەرمەڕە لە ڕاسەری مردووەکەداو لە شێوەی خاچدایە و ناو و تەمەن و شتی لەم جۆرەی کۆچکردووی لە سەرە، بەڵام من لە گۆڕستانە موسڵمانەکەی ئەتلەنتادا گەلێ گۆڕم بینی بە مەرمەڕ ڕازێنرابۆوە کە زۆریان کۆچیان کردبوو بۆ ئەو وڵاتە و لەوێ گۆڕغەریب بووبوون. یەك لەوانە گۆڕی پیاوێکی هندی بوو کە لێی نووسرابوو: ئەمە گۆڕی خوالێخۆشبوو کۆلۆنێل دوکتۆر حاجی فلان کەسی خەڵکی بۆمبایە لە هندستان و ساڵی ئەوەندە لە دایکبووە و ساڵی ئەوەندەش کۆچی دوایی کردووە.

ئەوەی کە بۆ ئێمە مایەی پەستیو دڵگرانییەکی زۆر بوو لە ماڵەوە پرسەکەمان دانا و تەنها بریتی بووین لەو چەند دۆست و دراوسێ کەمەی لە دەوریان و تەسجیلێکی قورئان خوێندن و کەسێك بە تایبەتی لە سەر تەلەفۆن بوو وەڵامی سەرەخۆشیی خزم و دۆستی دەدایەوە لە ویلایەتەکان و ئەورووپا و کوردستانەوە و هەروا ئەمەریکی و ڤێتنامی و ئەفریقی و ڕەگەزی جۆراوجۆری دراوسێمان بوون کەچی لە فەرهەنگی کەسیاندا نەبوو بێنە لامان و قسەیەکی دڵدانەوە و پەژارە دەربرینمان لەگەڵ بکەن و لەولاشەوە لە کوردستانەوە تەلەفۆنمان بۆ دەکرا کە پرسەیەکی زۆر قەرەباڵغی هەیە.

بێگومـان کەسـێك لـە وڵاتـی خۆمـاندا ئـەوەی بەسـەربێت و مردوویـەکی لێبمرێـت دەسبەجێ خـزم و دۆست لێی کۆدەبنـەوە و خۆیشـی نـازانێ کاروبـاری بەخاکسـپاردن و پرسەی چۆن بەڕێوەدەچێت و تاچەند ڕۆژێك خەڵك لـە دەوری کۆن و لـە سـەرێکەوە ئـەم کارە بە ڕووکەش و ڕۆتین دێتـە بـەرچاو، بەڵام کە کەوتیتـە غـەریبی و کارەساتێکی وات لێقـەوما و کەسـێکی ئـەوتۆت لـەدەور نـەبوو ئەوکاتـە دەزانـی ئـەم پەیوەندییـە کۆمەڵایەتیانـەی لای خۆمـان چـەند دیاردەیەکی جوان و ئیجابین. چونکـە هـەر بـە دەم ئاسانە گوزارش لەو بارە دەروونییە بکەیت کەسێکی ئازیزت لەو دوورەوڵاتییە لەدەست بچێت و کەست لەدەور نەبێت و هەموو پرسەکەت بێتە سەر تەلەفون و تەلەفۆنکاری. ئای کە ستەمە دەروونـت کەیلی دووکەڵی غوربـەتێکی تـاڵ بێـت و لـەم غوربەتەشـدا کۆسـتت بکەوێت و پارچەیەك لە جگەرت بکرێتەوە و گۆڕغەریب بکرێت و دەوریشت چۆڵ بێت. ئەو دەمە ئێمە بۆ خۆمان دەگریاین و بۆ ئەو فەرهەنگ و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییـەی لـە وڵاتـی خۆمـان هاکـەزایی سـەیرمان دەکـرد و قـەدرمان نـەدەزانی وا ئێستا لێمـان بـوو بـە ژانێکی بەسوێ و مەگەر هەر خۆمان بزانین چەند سەخت بوو.

کاك شیروان تازە چووبوە سەر کاری ئەندازیاریی خۆی و تازە چەند ڕۆژێك بوو دەوامـی دەکـرد و ئـەو ڕۆژەی کـە بـاوکی کۆچـی دوایـی کـرد و هـەموو پێکـەوە سـەرقاڵی کاروبـاری بەخاکسپاردنی بووین و کاتێ نیوەڕۆ دڵتەنگ و خەمبار لـە گۆڕستان گەڕاینـەوە، لـە لایـەن بەڕێوەبەری دائیرەکەیەوە تەلەفۆنێك بۆ ماڵەوەیان کرا و وتیان بۆچـی ئـەمڕۆ دیـار نیـە و نەهاتووە بۆ دەوام؟ ئێمەش پێمانوتن باوکی کۆچـی دوایـی کـردووە و خـەریکی ڕێوڕەسمـی ناشتنی تەرمەکەین کەچی جەنابی بەڕیوەبەر زۆر بە خوێنساردییەوە وتـی: چاکـە کـە لـە ناشتنی بوونەوە با بێت بۆ دەوامەکەی!! جا توخوا وەرە لە کولتوورێکی وادا هەڵکە و خۆت بگونجێنە!!

# له تایفوونه‌وه بۆ تۆرنادۆ

لـه ناوەڕاسـتی مـانگی دیسـەمبەری ١٩٩٦ دا گەیشـتینە دوورگـەی گـوام، کـە بـوو بـە قۆنـاخێکی گرنگی سـەفەرەکەمان بـەرەو ئەمـەریکا. وەك پێشـتر ئامـاژەم بـۆ کـرد ئـەم دوورگەیـە دەکەوتـە نـاو ئۆقیانووسـی پاسـیفیکەوە و یـەك لـە دوورگـەکانی هـەرێمی مایکرۆنیزیا و ماریانای باکوور پێکدێنێ و لە ڕووی جوگرافییەوە بە نزیکەی سێ سەعاتی فرۆکـە دەکەوتـە ڕۆژهـەڵاتی وڵاتـی فلیپینـەوە و ڕۆژهـەڵاتی چـین وباشـوری ڕۆژهـەڵاتی ژاپۆنەوە.

من پێشتر لە زەینی خۆمدا وێنەی باس و گەشتەکانی سندبادم بۆ دوورگە کێشابوو، وەك ناوچەیەکی لماویی ڕووتـەنی بە دەریا و زەریا چواردەور گیراو، کەچی کاتێ لە گـوام دابـەزیم ڕوانیـم ئـەم شوێنە نـە لـە و نـە ڕووتـەن بـەڵکو یەکپارچـە سـەوزایی و دارستان و شاخی بە دارودرەخت داپۆشراو بوو. دوورگەی گـوام لـە سـەر هێڵـی پـانی ١٣ پلەی سەروو هێڵی کەمـەری زەوی و گـەرم و شـێدار بـوو، بـەڵام لـەجوانیدا وێنـەی دەگمـەن بـوو لـە دنیـادا و قیبلـەی گەشـتیارانی جیهان بـوو بـە تایبـەتی ژاپۆنییـەکان. فرۆکەخانەیـەکی زۆر گـەورەی نێودەوڵـەتیی تێدابـوو، هـەر تاوناتـاوێك فرۆکەیـەکی لێدەنیشـتەوە یـان دەفـڕی و بووبـووە مایـەی سـەرنج و سەرسـامیی ئێمەیـەك کـە بـە زۆری فرۆکەی جەنگیمان دەبینی بۆردمانی دەکردین و خۆمـان لێدەشاردەوە. نامـەوێ لێرەدا بێمە سەر باسکردنی ژیـان و گوزەرانمـان لـەو سێ چوار مانگەی مانـەوەمان لـە گوامـدا، چونکـە پێشـتر باسێکم لێـوە کـردووە، بـەڵام ئـەوەی زۆر سـەرنجی ڕاکێشـاین زریـانی تایفوون Typhoon و ئەو مەترسییە گەورەیـەی بـوو کـە ئیـدارەی دوورگەکـە و خەڵك لەوێ حیسابی وردیـان بـۆ دەکـرد و ئێمە هـەر کـە گەیشـتینە ئـەوێ دەسـبەجێ ڕێبـەرێکیان داینـێ لـە سـەر دوورگەکـە و ژیـان و گـوزەران تێیـدا و ئـەوجا چۆنێتـی خۆپاراسـتن لـە تـایفوون. زۆربـەی خانووەکـان شیشـبەندی ئاسـن لـە سـەر پەنجەرەکانێتی و وەك دەرابەی دوکان بەرز دەکرێتەوە و لە حاڵەتی زریانی تایفووندا دادەدرێتەوە و بێجگە لەوە توورەکە خۆڵیش لە بەر دەرگا و پەنجەرەدا دادەنرێت.

من لـە ئەڵقـەکانی پێشتردا کـەمێك بـە وردی باسی تایفوونم کـردووە و ئەمـەی ئێستا دەینووسـم تەنـها وەبیرهێنانەوەیەکە و لێدوانـە لـەو لایەنانـەی ئـەو کاتـە باسـم نـەکردبوو.

ئێمه ئەو ماوەیەی لەوێ بووین تەنها یەك جار زریانی تایفوون هەڵیکرد و چەقی گەرداوەکەش نزیکەی دووسەد میل لە گوامەوە دوور بوو و زیاتر دوورگەی سایپانی دراوسێی گرتەوە و لەگەڵ ئەوەشدا لای ئێمە لە گوام ماوەی نزیکەی هەفتەیەك باران و ڕەشەبای توند بوو. ئەم زریانە زیاتر لە دەریای چین وحەوزی ڕۆژهەلاتی چین و فلیپین و ژاپۆندا هەڵدەکات و خێرایی با دەگاتە زیاد لە ٢٠٠ کیلۆمەتر لە سەعاتێکدا و ساڵانە زیانی زۆر بەرپا دەکات، بە زیانی گیانیشەوە، بە تایبەتی کاتێ ناوچەیەك بەر چەقی زریانەکە دەکەوێت. بە هەرحاڵ ئێمە کاتێ گوامەمان بەجێهێشت لە دوو سەرەوە پێمان خۆشبوو، یەکەمیان ئەوە بوو لەو دڵەڕاوکێیەی مەسەلەی چارەنووسمان ڕزگارمان بوو و ئەنجام چووینە خاکی ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە، دووەمیش لەو تایفوونە بەسامەی هەردەم هەڕەشە بوو لە سەر خەڵکی ئەوێ و هەر زوو بیرمان چووەوە. بەڵام دیسانەوە لە ئەمەریکا ئێمە بەر ویلایەتێك کەوتین کەوا بە زۆنی زریانی تۆرنادۆ دەژمێردرا و ئەوێش زیانێکی مادی و گیانی زۆری بەرپا دەکرد. ئەم تۆرنادۆیە بە پێچەوانەی زریانی تایفوونەوە لە وشکاییدا بەرپا دەبوو، گەڵ جاریش بە شێوەیەکی کوتوپڕ و لە چاوترووکانێکدا دەستی خۆی دەوەشاند و نەدەما و جاری واشبوو ڕێڕەوەکەی هێڵێکی باریك بوو، یان لە شارێکدا گەڕەکێك یان بەشێك لەو گەڕەکەی وێران دەکرد و ماڵەکانی ئەمدیو و ئەودیوی ئەو هێڵە زیانیان پێنەدەگەیشت. زریانی تایفوون زووتر پێشبینی دەکرێت و ڕێڕەوەکە دەسنیشان دەکرێت کە دوورودرێژە و هەرشوێنێك بەرچەقەکەکەی نەکەوتبێت، کە پێیدەوترێ چاو، ئەوە زیانی قورسی بەرناکەوێت. کەچی تۆرنادۆ کارەساتێکی زۆر پڕ ترس و سامە و لە خێرایی و کوتوپڕیی ڕوودانیدا زیاتر لە بوومەلەزرە دەچێت وەك ئەوەی کە لە زریان و گەرداو بچێت و کاریگەریی وێرانکاریشی زۆرە.

جۆرجیا ئەو ویلایەتە بوو کە ئێمە بە پێی پلانی دابەشکردن و نیشتەجێکردنی دەزگای کۆچی ئەمەریکی تێیکەوتین. ئەم ویلایەتە و زیاد لە هەشت نۆ ویلایەتی باشوور وباشووری ڕۆژهەلات وناوەڕاستی وشکایی ئەمەریکا ساڵانە لە بەهاراندا بەر ئەم زریانە توندە دەکەون. لەوانە ویلایەتەکانی تەنەسی، ئەلەباما، تەکساس، ئۆکلاهۆما، میسوری، کەنساس، لویزیانا، ئیلینۆی، ئایوا، نبراسکا و.. تاد. بۆ نەگبەتی زۆربەی خانووبەرە لەوێ لە تەختەدار دروست دەکرێت و کاتێ تۆرنادۆ هەڵدەکات فرەجار ساپیتەی خانوو بە ئاسماندا دەبات و دارلە بن هەڵدەکێشێ و تەنانەت ئۆتۆمبیلیش دەبات و تلیدەداتە دۆڵ و شیودوە و

خەڵك دەكوژێت و خانوو دەڕووخێنێت. لەگەڵ ئەوەشدا كە لە ئەمەریكا دەزگای تایبەتی كەشناسی زۆر بەهێزە و ڕۆژ بە ڕۆژ و بگرە سات بە ساتی گۆڕانی باری كەشوهەوات بە وێنەی سەتەلایتی دەداتێ و تەنانەت دەزگایەكی تایبەتی زریانە سەختەكان و تۆرنادۆ هەیە بە ناوی تاقیگەی نیشتمانی زریانە قورسەكان كە بنكەكەی لە شاری نۆرمانی ویلایەتی ئۆكلاهۆمایە، كەچی ئەم تۆرنادۆیە هەر كاری خۆی دەكات و زەبری خۆی دەنوێنێ.

مێژووی تۆرنادۆ لە ئەمەریكادا پڕە لە چیرۆكی جۆراوجۆری خەڵك كوشتن و زیانی مادی. كوشندەترین تۆرنادۆ كە تۆمار كرابێت ١٨ ی مارتی ساڵی ١٩٢٥ بوو كە لە ویلایەتەكانی ناوەڕاستی ڕۆژئاوادا هەڵیكرد و ٦٨٩ كەسی كوشتووە. لە ٤ ی نیسانی ١٩٧٤ دا ١٤٨ زریانی تۆرنادۆی پڕ لە كاولكاری لە ١٣ ویلایەتی دا و ٣١٥ كەسی كوشت. لە ٣١ مایسی ١٩٨٥دا تۆرنادۆ كوڕێكی شەش ساڵانی لە باوەشی دایكی فڕاند و لەگەڵ ١١ كەسی تردا بوون بە قوربانی. دەیان چیرۆكی لەم بابەتە لە مێژووی تۆرنادۆدا هەن لەم وڵاتە.

ساڵانە نزیەی ٨٥٠ تۆرنادۆ لەو وڵاتە دەدات، بەڵام ژمارەیەكی زۆر كەمی كوشندەیە و خێرایی با لە جۆرە كوشندە كانیاندا لە نێوان ٢٣٠ – ٢٦٠ كیلۆمەتر لە سەعاتێكدایە و هەرچییان بێتەڕێ وێرانی دەكەن و دار و دیواری دەدەن بەسەریەكدا. لە ڕووی زانستییەوە هۆكاری دروستبوونی زریانی تۆرنادۆ ئەوەیە كە بایەكی زۆر سارد و وشك لە باكوور و سنووری كەنەداوە هەڵدەكات و بە سەر زنجیرە چیاكانی ڕۆكیدا تێدەپەڕێ بەرە و باشوور و باشووری ڕۆژهەلات و لە ناوە ڕاستی ئەمەریكادا بە زۆری ئەم با ساردە لەگەڵ بایەكی گەرمی شێداردا كە لە كەنداوی مەكسیكەوە لە باشوور هەڵدەكات و لەو شوێنانەدا كە تۆرنادۆكەی تێدا دروست دەبێت دەدەن بەیەكدا و لە تێكەڵبوونی ئەم با سارد و گەرمە خێراییەكی گەورەی با دروست دەبێت و لە شێوەی گەرداوی لوولەكی و چەشنی ڕەحەتیدا دەچن بە ئاسماندا و ئەو زریانە كاولكارەیان لێ پەیدا دەبێت. ئەم بای سارد و گەرمە لە كاتی تێكەڵبوونیاندا گێژەڵووكەیەكی سەرەكی دروستدەكەن و بە چواردەوریشیدا كۆمەڵێك گێژەڵووكەی لەوە بچووكتر دروست دەبن و هێزی كاولكارییان بەندە بە خێرایی ڕەشەباكەوە.

لە بەهاراندا ویلایەتەكانی خوارەوەوە لە سەرەتای هاوینانیشدا بەرەوژوور هەڵدەكشێ و ویلایەتەكانی سەرەوە پێوەی گرفتار دەبن و سەرباری تەكنیكی پێشكەوتووی چاودێری

کردنی کەچی هێشتا نەتوانراوە بەر لە زیانەکانی بگرێت و بگرە هەندێ جاریش ئەوەندە بە خێرایی دروست دەبێت ئەوتەکنیکە پەی بە پێشبینی کردنی نابات. لە گەڵ بەرپابوونی زریانەکەدا ئاسمان تاڵ دەبێت و گەواڵە هەور دەکەونە تەپولوول و لە ماوەیەکی کەمدا ئەرز و ئاسمان دەنیشنە سەر یەك.

زۆر جار تۆرنادۆ وەك تاوە تەرزەی بەهاران شوێنێك دەگریتەوە و تەنیشتەکەی دەبوێرێ. لە مانگی نیسانی ساڵی ١٩٩٨دا تۆرنادۆیەکی سامناك لای ئێمە دروستبوو بەڵام دەزگای زریان و کەشناسی زوو خەڵکی لێ ئاگادار کردەوە و هەموو خەڵك چوونە نهۆمی خوارەوەی خانوو و شوقەکانەوە و ئەو کاتە من لە ئیش بووم و ماڵی ئێمە، کە لە تەلەفزیۆنەوە سات بە ساتی ڕێڕەوی تۆرنادۆکەیان چاودێری دەکرد، چووبوونە ماڵە مەکسیکییەك لە نهۆمی خواردوەی ئەپارتمانەکەمان و تا زریانەکە ڕەویبووەوە لەوێبوون، هەرچەندە فەرهەنگی دراوسێتیی ئەوێ وەك لای خۆمان نیە بەڵام لە دۆخی سامناکی وادا ترسی مەرگ هەموو شتێك دەخاتە لاوە. زریانەکە سەرووی ئێمەی گرت و دای لە بەشێکی شارێکی باکوورمان کە ١٥ کیلۆمەترێك لە ئێمەوە دووربوو و لە ماوەیەکی زۆر کورتدا زیاد لە ٣٠٠ خانووی ڕووخاند و هەشت کە سی کوشت و دەیانی بریندار کرد و هەرچی تۆڕی کارە با و تەلەفۆن وخزمەتگوزاریی ترە وێرانی کرد.

هەر لەو مانگەدا زریانێکی هاوچەشن لە شاری ناشڤیلی تەنەسی زەرەرێکی زۆری دا و ساپیتەی خانووی ماڵە کوردێکی بردبوو بە ئاسماندا بەڵام خۆشبەختانە خۆیان سەلامەت دەرچووبوون. سەیر ئەوەیە لەگەڵ ئەو ترسناکییەی زریانی تۆرنادۆدا کەچی لێرە نەریت وایە کەوا زۆربەی کەرەستەکانی خانوو دروستکردن هەر لە تەختە بێت. هەرچەندە دەزگاکانی چاودێری و لێکۆڵنەوەی تۆرنادۆ ئامۆژگارییان وایە کە خانووی کۆنکریت بەرگرییەکی باش لەو زریانە دەکات، بەڵام ئەو خووەی لە سەردەمی کۆچی ئەوروپاییە کۆنەکانەوە بۆیان ماوەتەوە بۆیان تەرك ناکرێت.

# ئەمەریكا.. وڵاتێكە بەردەوام غوربەت بەرهەمدێنێت

هەر ئێمە نەبووین تووشی ئەو غوربەتە تاڵە بووین لەو وڵاتەدا، تاڵ و بەڵكو سروشتی كۆچی بەردەوام لە هەموو قوژبنێكی سەر ئەرزەوە بۆ ئەو وڵاتە و دابڕانی خەڵكەكە كۆچبەرەكە لە ژینگە و فەرهەنگی ڕەسەنی وڵاتی خۆی تا چەندین ساڵ تووشی حاڵەتێكی سایكۆلۆجیی تایبەت دەبێت و یادی ئەو فەرهەنگە دەكات كە لە پشتی بەحرەوە جێی هێشتووە، سا بە هەر هۆیەكەوە بووبێت، هەڵاتن بێت لە دەست زوڵم و ستەم یان سەری خۆ هەڵگرتن بێت بە دوای پاروە نان و بژێویدا. پێموایە هەموو كەس حەز دەكات لە وڵاتی خۆیدا سەربەرز بژێت و لە هیچی كەم نەبێت. بەڵام مێژووی ستەم جیهاندا و دابەشبوونی سامانی ئابووری و سروشتی شتێكی تر دەگێڕێتەوە و هەمیشە كۆمەڵی مرۆڤایەتی شەپۆلی جۆراوجۆری كۆچی بەخۆوە دیوە. لە نزیكەی چوارسەد ساڵی مێژووی ئەمەریكاشدا كۆچكردن بۆ ئەو وڵاتە بووە بە كولتوورێك كەوا مێژوویەكی تاڵ بۆ هەندێك بۆ هەندێكیش شیرینی هەیە.

كاتی خۆی خەڵكێكی زۆر لە ئەوروپاوە شەپۆل لە دوای شەپۆل كۆچیان كردووە بۆ ئەم كیشوەرە و هەرئەوەندەی كەشتییەكانیان لەوێ لەنگەری گرتووە بەرەوڕووی ململانێی سەختی ژیان بوونەتەوە و ئەگەریش لەو كۆچە پەشیمان بووبێتنەوە ئاسان نەبووە جارێكی تر بچنەوە وڵاتی خۆیان و سەردتای ژیانی سەختی ئاوارەیی و غوربەتیان پێ باشتر بووە لە ستەمی ئاینی و سیاسی و هەژاری لە وڵاتی ڕەسەنی خۆیاندا. خۆ ئەگەر ئەو كۆچەی ئەو سەردەمە بۆ هەندێك ئەوروپایی چاولێكەریی بووبێت و كابرا بە خاوخێزانەوە جڵەوی چارەنووسی خۆی دابێتە دەست كەشتییەك و بە هەزار ناڵی عەلی لە ئۆقیانووسی ئەتڵەنتیك پەڕیبێتەوە بۆ كیشوەری نوێ و بەهەشتی خەیاڵ و لەوێ ئەگەر ئەو بەهەشتەشی بە نسیب نەبووبێت و لە ناخی خۆیدا پەشیمان بووبێتەوە ئەوە نەیتوانیوە جارێكی تر پارەی پاپۆر بدات و بگەڕێتەوە و بە لایشیەوە سوار بوون عەیبێك و دابەزین دوان بووە.

من دڵنیام لەوەی ئەو مرۆڤانەی بەدرێژایی مێژوو كۆچیان كردووە بۆ ئەمەریكا، كەم تا زۆر هەر هەموو وەك ئێمە دەردی تاڵی غوربەتیان چەشتووە و خۆ ئەو دەمەش ساڵی جارێك نامەی ئازیزێكی وڵاتی خۆیانیان پێبگەیشتایە ئەوە بەخت یاریان بووە و بۆ گەلێكیشیان ئەو نامەیەی هەرگیز پێنەگەیشتووە. تۆ لە دەلاقەی مێژووەوە تەماشای جوگرافیای ئەمەریكا بكە، بڕواتان بێت شار نیە لە ئەوروپای كۆنەساڵدا ناوەكەی لەو

ئەمەریکایە دووبارە نەبووبێتەوە و لە شارێکی تازە ئاوەدانی ئـەو ولاّتـە نـەنرابێت. بۆ نموونە لەندەن، بیرمنگهام، ئۆکسفۆرد، پاریس و دەیان شاری تری ئـەوروپا ئێستا نـاوی شارن لـە ئەمـەریکادا. سـویدییەکان، هۆلەندییـەکان، ئینگلـیز و فەرەنسـییەکان دوای کۆچکردنیـان هـەر شـوێن و شـارێکیان ئـاوەدان کردبێتـەوە لـەوێ نـاوی شـار و شـارۆچکەیەکی خۆیانیـان لێنـاوە. مێـژوو دەگێڕێتـەوە کـەوا کۆمـەڵێکی زۆری هۆلەندییەکان کۆچیان کردووە بۆ ناوچـەی مانـهاتن و نیویۆرکی ئێستا و ئەو دەمەی ئەم شارەیان ئاوەدان کردووەتەوە بە یادی شاری ئەمستردامی ولاّتی خۆیان ناویان نـاوە نیوئەمستردام و پاش ساڵانێکی زۆر گۆڕاوە بۆ نیویۆرك. شیاوی باسە کاتی خۆی ئـەم کۆچبەرە هۆلەندییانـە هەموو ناوچەی نیویۆرکیـان لـە خێڵە هندییەکان کڕیـوە بـە بایی بیست و چوار دۆلار متوموورووو!

تـا ئێستاش ویلایەتـەکانی کـەناری ئۆقیانووسی پاسیفیك لـە ڕۆژئـاوای ئەمـەریکا، بـۆ نموونە کالیفۆرنیا مۆرك و فەرهەنگی ئیسپانیا و پورتوگاڵی تێدا باوە چونکە پێشتر هێزە دەریاییەکانی ئەوان ئەو کەنارانەیان داگیرکردووە و پاشانیش خەڵکەکەی ئەوێ کۆچیان بۆ کردووە. ناوی شارەکانی سان فرانسیسکۆ و لۆس ئەنجلس و سانتیاگۆ و چەندینی ترهـەموو لە کولتووری ئـە دوو ولاّتـەوە وەرگیراون. ئـەو شوێنەی ئێستا ویلایـەتی لویزیانایـە کاتی خۆی ملکی فەرەنسا بـووە و لـە سەردەمی یـەك لـە پاشاکانی فەرەنسادا کـە نـازانم لویسی چەندەم بـووە فرۆشـراوە بـە ئەمـەریکا، تـا ئێستاش مۆرکی کۆچبەرە فەرەنسییەکان بـە لویزیانا و هەموو ئەو شوێنانەوە دیارە کە ئـەوانی تێدا نیشتەجێ بـوون. مـن لـەوێ زۆر سـەرم سوڕمابوو لـە نـاوی ئـەو شـار و شـوێنانەی پاشـکۆیان ڤیـل ville بـوو وەك نەشـڤیل Nashville، نۆکسڤیل Knoxville، جاکسـۆنڤیل Jacksonville، دۆرەڤیـل Doraville.. تـاد. باوەڕتان بێت بە قەدەر ناوەکانی پاشکۆ ئاباد لە ئێران و پاکستان و هندستان چەشـنی شا ئاباد، ئەحمەد ئاباد، حەیدەر ئاباد، ئیسلام ئابـاد..تـاد ئـەوەندە نـاوی شار و شوێنی پاشکۆ ڤیل هەیە لەو ولاّتەدا و کاتێ پرسیاری ئەو دیاردەیەم کرد وتیان کولتووری فەرەنسییە. بە هەمان شێوە چەندین شاری پاشـکۆ بـورگ Burg یـش لـەو ولاّتـەدا هـەن، چەشنی، سـانت پیتێرسبورگ Sant Petersburg (لـە فلۆریدایـە)، ڤیکسـبورگ Vicksburg، هاتیسـبورگ Hattisburg کـە زیـاتر مـۆرك ئـەڵمانی و ڕووسین. دەڵێن چەمچـەماڵ نـاوی هـەمان ئـەو شوێنەیە لە ناوچەی کرماشان کەوا هەمەوەندی لێوە هاتووە بـۆ ئـەم شوێنەی ئێستایان و وەك پەرۆشی و یادگارییەك بۆ ئەو مەڵبەندەی خۆیان ئەو ناوەیان لەم شوێنە ناوە کە تازە ئاوەدانیـان کردووەتـەوە. دەبـێ چ دەردێکـی دوورییـان چەشـتبێ و چـەند پـیرەمێرد و پیرەژنیـان بـە تاسەی چەمچەماڵەکـەی زێدیانـەوە سـەریان نابێتـەوە! جـا وەرە کەسـێك چەندین مانگ دەریای تەی کردبێت و پاشان کە گەیشـتبێت ئیـتر سۆراخی ولاّتـی ڕەسـەنی

خۆی نەمابێت دەبێ چ هەناسەساردییەکی تووشی بووبێت و تاکە قەرەبووی دەروونیی ئەوە بووە ناوی گوندو شارەکانی خۆی لە نیشتەجێ تازە ئاوەدانکراوەکانی ئەو وڵاتە ناوە.

ئێستاش سەرەڕای ئەو پێشکەوتنە هەمەلایەنەی سەرتاپای ئەو وڵاتەی گرتووەتەوە کە پرسیار دەکەیت لە کەسێکی ئەمەریکی، کەوا باوباپیرانی چەند پشت پێشتری هاتوونەتە ئەو وڵاتە، لە بنەڕەتدا خەڵکی کوێی، لە وەڵامدا پێت دەڵێ باپیرە گەورە گەورەم لە بەریتانیا، فەرەنسا، ئیتاڵیا، سوید، نازانم کوێ کۆچی کردووە بۆ ئێرە. واتە ئەو بارە دەروونییەی ئینتیما و غوربەتە پشتاوپشت گوێزراوەتەوە بۆ نەوەکانی دواتر و با ئێستا لە وڵاتی ڕەسەنی باوباپیرانیشیاندا کەس نەناسن و کەسیان نەمابێت.

ماڵی ئەو مستەر سنۆیەی یەکەمجار خانەخوێی ئێمە بوو، باسی ئەوەی دەکرد کە باوباپیرانی سەد و پەنجا ساڵێك لەمەوبەر لە ئێرلەندەوە هاتوون و تا ئێستا گەلێ نەریتی ماڵە کۆنەکانی ئەو وڵاتەیان پاراستووە و ساڵانە خێزانە ناودارەکانی بە ڕەچەڵەك ئێرلەندی فێستیڤاڵێك دەکەن و نەریت و کەلەپووری دێرینیان دەخەنەڕوو، تەنانەت لەو ڕۆژەدا ژنان و پیاوانیان جلی چەند پشت لەمەوپێشیان دەپۆشی و شمشێر و ڕم و چەکی ئەو ڕۆژگارە لە خۆ دەدەن و کولتووری ئەورووپای سەردەمی سوارچاکی نمایش دەکەن. ئەڵبەتە زۆر لە تیرە و تایەفەکانی تر ئەم نەریتەیان هێشتووەتەوە و مۆدێرنیتە و تەکنۆلۆجیا بە شوێنی خۆی و وننەکردنی ڕەگوڕیشەش بایەخی گەورەی خۆی هەیە و لەمپەریش نیە لە ڕێی پێشکەوتنی کۆمەلایەتی و ئابووری و فەرهەنگیدا بەڵکو پاڵنەرێتی.

ئێستاش هەر کەسێکی ئەو وڵاتە، کە چەندین پشتی لەوێ لە دایکبووە، هەر کە قسەت لەگەڵ دەکات یەکەم شت ئەوەیە پێت دەڵێ ئاگات لێبێت فەرهەنگی ڕەسەنی خۆت لە دەست نەدەیت. ئەم قسەیەشی لە خۆڕا نیە، چونکە کولتووری ڕەسەن لەدەستدان لە سەرلێشێوان و خۆ ونکردن بەولاوە هیچیتر ناگەیەنێت. لۆرا دۆفەر ژنێکی شۆخ و جوان بوو لە شاری ڕۆزوێڵ، بووبوو بە ئاشنامان و لەگەڵ پیرەژنێکی دایکی کە ناوی مەیلی بوو هاتوچۆیان دەکردین. دایکی مەیلی عەرەبێکی لوبنانی بووە و لەم ڕووەوە مەیلی جۆرە سۆز و خۆشەویستییەکی بۆ لوبنان هەبوو هەرچەندە نەیشیبینیبوو چونکە هەر بە گەنجی دایکی مردبوو. مەیلی تاکوتەرایەکی کەمی زمانەکەی دایکی بیرمابوو، تەنانەت لۆرای کچیشی شتێکی لێوە فێربووبوو و ناوبەناو هەندێ وشەی عەرەبیی لوبنانی وەك (هەرام، کبی، بەددی..) تێکەڵ بە زمانەکەی خۆی دەکرد و وەك خۆی دەیوت گەلێ جار ژنە ئەمەریکییەکانی دەستەخوشکی بە بزە و سەرسوڕمانەوە پێیاندەوت ئەوە چی دەڵێی!

لەم ساڵانەدا عادیل ئیمامی هونەرمەندی ساتیریکی میسری فیلمێکی بەرهەمهێنا بە ناوی "هەلەو ئەمەریکا". فیلمەکە زۆر خۆشە و بە شێوەیەکی کاریکاتێریانە و گاڵتەئامێز ژیانی مرۆڤ لەو وڵاتەدا دەخاتەڕوو، لە هەمان کاتیشدا ئەو پەیامەی لە پشتەوەیە کەوا

خەڵکی کولتوور جیاواز لە فەرهەنگ و کولتووری ئەمەریکا کاتێ بە دنیایەك خەونی ڕەنگاوڕەنگەوە کۆچ دەکەن بۆ ئەو وڵاتە و لەوێ دەڕوانن هیچ شتێك لە فەرهەنگی کۆمەڵگا و وڵاتە ڕەسەنەکەی خۆیان ناچێت و لێرەوە تووشی ئەو غوربەتە فرە ڕەهەند و بێئامانە دەبن و ململانێیەکی سەخت لە ناخی بنیادەمدا دروست دەبێت، ئایا کولتووری خۆی وەك ئەوەی هەیە بیپارێزێت یان بە شێویەیەك لە شێوەکان لە گەڵ ئەوەی ئەوێدا بیگونجێنێت، کە ئەمەیان زۆر زەحمەتە و زۆر کەس لەم بوارەدا نوشوستی دێنیێت و نە ئەوەیە کولتوورەکەی خۆی پێ بپارێزرێت و نە ئەوەشە ئەوەی ئەوێی پێ قووت بچێت و لەم چەقی ڕێگایەدا گیردەخوات و دەبێت بە مەخسەرە. نموونەی ئەم بارە لە کوردی ئەورووپا نشیندا زۆرە لەوانەی کە بە پارەی سۆشیاڵ خۆ دەلێسنەوە و ناوبەناو باوکێك پەیدا دەبێت کچەکەی خۆی وەك کارە کۆرپە سەردەبڕێ گوایە ئابڕووی خۆی سەندووەتەوە!

هەیە تازە کۆچی کردووە بۆ ئەمەریکا و دەیەوێت خێرا ببێتە ئەمەریکییەك کە باوباپیرانی لە زەمانی جۆرج واشنتۆنەوە کۆچیان کردووە بۆ ئەو وڵاتە و هەر خێرا ناوی خۆی و ئەجدادی دەگۆڕێ و هەشە دەکەوێتە ژێر کاریگەریی مسیۆنێرەکان و دەبێ بە مەسیحی. من لە ناخی خۆمدا و بە بڕوایەکی تەواوەوە ڕێز لە هەموو ئینتیمایەك دەگرم بۆ هەر ئاین و مەزەب و نەتەوە و بیر و باوەڕێك و نازانم تا چ ئاستێك خەڵکانی شوێنەکانی تری سەر گۆی زەوی پابەندن بە نەریت و فەرهەنگی ڕەسەنی خۆیانەوە، بەڵام ئەوە باش دەزانم کەوا داماڵینی ئاین و نەتەوە و نەریتی ڕەسەن لای خەڵکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و فەرهەنگ موسڵمان شتێکی نەنگ و ئابڕووچوونیشە. من ڕەنگە ئەو سیفەتەم پڕ بە پێستی خۆی بەسەردا بسەپێت کە هەر بە ناو موسڵمانم بەڵام هەمیشە بڕوام وابووە ئەو موسڵمانەی دەبێ بە مەسیحی وەك ئەو کوردەی جارانی سەردەمی ڕژێمی لەناوچووی عێراق وایە کە دەبوو بە بەعسی و شێلگیرانە و قەرەقۆز ئاسا کاری بۆ جێگیرکردنی پەیامی ناسیۆنالیستیی ئیفلیجی بەعسیان دەکرد.

جارێکیان لە بازاڕی کرۆگەر ژنێکی گەنج هاتە بەر مێزەکەم و هەر بۆ خۆشی پرسیاری ناوەکەیم کرد و کاتێ وتی لەیلا تەزوویەك بە ناخمدا هات و وتم پێدەچێت عەرەب بێت، وتی بەڵێ لە بنەچەدا خەڵکی میسرم، منیش کۆڵێ گەشامەوە و بە عەرەبی کەوتمە دواندنی، بەڵام ئەو نە هێنای و نەبردی و ڕێکوڕەوان هەر بە ئینگلیزی وتی من ئێستا نە عەرەبم و نە میسریم و تەنها ئەمەریکیم! هەڵوێستی ئەو ژنە کابرای لەمەڕ فیلمەکەی عادیل ئیمامم بیردەخاتەوە کە لە میسرەوە کۆچی خێری ئەمەریکای کرد و لە ماڵی ئامۆزاکەیدا بوو بە خزمەتکار و سێنسۆری موبەقەکەیان بە دووکەڵی جگەرەکەی کەوتە زیڕەزیڕ و ئەمبولانس و ئاگرکوژێنەوەی گەیشتە سەر و ئەمیش مێشێك میوانی نەبوو.

ئێمەش جارێکیان بەزمێکی لەم بابەتەمان تووش بوو. کاک ئازاد و ئاشنا خانی خێزانی لە ماڵی خۆیاندا بانگهێشتی گۆشتی برژاویان کردین. ئازاد بە دەستووری لای خۆمان مەقەڵیی لێدەمدا و نێڵەی ئاگر کەمێك بەرز بووەوە و هەر ئەوەندە گۆشتەکەی برژاند و بێ ئێوە ناخۆش دەستمان بۆ برد هێندەمان زانی چواردەورمان بوو بە لووورەی ئەمبولانس و ئاگرکوژێنەوە و پۆلیس لە دەرگایان دا و بە ئەدەبەوە پێیان وتین ئەم کارە لەم ولاتەدا رێگەی پێنادرێت و وا دەرودراوسێکانتان ترسی ئاگرکەوتنەوەیان لێنیشتووە. جیا ناهەقیشیان نەبوو خانووەکان تەختە بوون و ماڵێك گڕی بگرتایە بیست سی ماڵی تری پێوە دەسووتا.

ئێمە لە سەرەتاوە کە چووینە ئەمەریکاوە هەر یەکە لای خۆیەوە غوربەت و دەردی دووریی ولات دەیکرۆشت و شەو نەبوو من خەون بە شوێنێکی ولات و سەرجەمی قۆناخەکانی منداڵی وگەنجێتیمەوە نەبینم و هەکەسێکیشم لە دۆست و ئاشناکانم دەدواند هەمان دیاردە ڕووی تێکردبوو، هەشمانبوو تووشی خەمۆکی و گۆشەگیرییەکی سەخت بووبوو. سەیر ئەوەیە کە هاتمەوە بۆ ولات بۆ یەك چرکەش چیە خەێکم بە تەنانەت خۆشترین شوێنی ئەو ولاتەوە نەبینی. ئێمە گەلێجار قەرەبووی ئەو دەردەمان بە تەلەفۆن کردن بۆ یەکتر دەکردەوە. شەوی وابوو بە سەعات زیاتر لە گەڵ کاك شیروان و برادەرانی تردا قسەمان دەکرد و دواتر کە حیسابی پشتشکێنی تەلەفۆنمان بۆ دەهاتەوە زۆر لە برادەران بە ناچاری تۆبەی دەکرد و تەنها بووبوو بە وەرگر و نەیدەوێرا زۆر تەلەفۆن بکات! بەلام ئێمەمانان دەردەکەمان زۆر کاری بوو و هەر کۆڵمان نەدەدا. بێجگە لە ماڵی کاك شیروان و بەرزانی برای و کاك هوشیار و کاك بەختیار و کاك جەمال کە لە گەڕەکی جۆنسبۆرۆی باشووری ئەتڵەنتا بوون و سەردانی یەکترمان دەکرد، لەو ماڵانەی کە دڵمان بە یەکتر دەکرایەوە و لە ویلایەتەکانی تر بوون و نەماندەتوانی بگەینە یەك، ماڵی مامۆستا حەمە عەلیی خزممان لە شاری ڕۆنۆکی ڤرجینیا، ماڵی کاك حەسەن لە فلۆریدا، ماڵی کاك عوسمانی ژاڵە لە مزووری، ماڵی شێخ جەلال لە وایۆمینگ، کاکە ئەردەلان و شادمانی برای لە شاری بافەلۆی ویلایەتی نیویۆرك، کاك شیروان مەهدی و کاك وەهاب و شیرین خانی خێزانی لە کۆلۆرادۆ، ماڵی پەخشان خان و کاك پێرس لە کۆنێکتیکەت، گەڵ دۆست و برادەری تر لە شاری ساندیاگۆی کالیفۆرنیا و ویلایەتەکانی نیومەکسیکۆ و تەنەسی و تەکساس، بەدەوام تەلەفۆنمان بۆ یەکتر دەکرد و کەمێك لەو خەمی دووری و غوربەتەمان دەڕەواندەوە. پاشان وردە وردە هەرکەس گرفتاری کار و ژیانی سەخت و پڕ هەڵپەی ئەو ولاتە بوو و تەلەفۆن کەمبوودوە. بەلام ئێمە و ماڵی مامۆستا حەمە عەلی هەر بەردەوام بووین و لانی کەم هەفتەی جارێك تەلەفۆنێکی دوورودرێژمان لە نێوانماندا هێشتەوە. ماڵیان ئاوا[illegible] وەك کاك سەروەت لە ئەڵمانیا و کاك نەجمەدین لە هۆڵەندا و

چەند خزم و دۆستی تر لە وڵاتە جیاجیاکانی ئەوروپاوە زوو زوو بە تەلەفۆن بەسەریان دەکردینەوە و زۆرێك لەو خەم و دووکەڵەی سەرەتای نیشتەجێبوونی ئەو وڵاتەیان لە سەرمان ڕەواندەوە. دۆستێکی بە ئەسڵ خەڵکی هەولێرم هەبوو لە دەوروبەری واشنتۆن دادەنیشت و لە ساڵانی حەفتاوە لەوێ بوو ، ناوی کاك عەبدولقادر محەمەد ئەمین بوو و کاك فەرهاد شاکەلی تەلەفۆن و ئەدرەسی منی دابوویە زۆر پیاوێکی مەرد بوو و باشی دەزانی دەردی غوربەتی یەکەمجار چەند سەختە، لە بەر ئەوە هەموو جار تەلەفۆنی تۆ دەکردم و زۆری دڵنەوایی دەکردم. کاك عەبدولقادر بڵاوکراوەی "بارزان" ی دەردەکرد و منیش یەك دوو بابەتم تێدا بڵاوکردەوە.

جێی خۆیەتی لێرەدا ئاماژە بۆ ڕۆڵی گەورە و بەرچاوی پۆستە بکەم لەم وڵاتەدا. لێرە هەر ماڵە و سندووقێکی پۆستەی خۆی هەیە و ڕۆژانە دەیکاتەوە بزانێ چی پێگەیشتووە و پۆستە ڕۆڵێکی گەورەی هەیە لە ئاسانکردنی پەیوەندی و کاروباری هەر کەسێکدا لە گەڵ بەنك و شوێنی کارکردن و ڕاییکردنی موعامەلاتی جۆراوجۆردا. ئێمە بێجگە لە تەلەفۆن لە ڕێگەی پۆستەوە پەیوەندیمان بە خزم و دۆستانی ئەوروپا و کەنەدا و ویلایەتەکانی تری ئەمەریکاوە دەکرد. من لەم ڕووەوە پەیوەندییەکی ڕۆحیی سەیرم بۆ دروست بووبوو لە گەڵ سندووقی پۆستەکەماندا و ڕۆژی وابوو دوو جار دەمکردەوە و ئەگەر نامەی کەسێکی تێدا بوایە شاگەشکە دەبووم پێی و فرە جار هەمووومان لە ماڵەوە بە فرمێسکەوە دەمانخوێندەوە. بیرمە جارێکیان تەواوی ڕۆژێکی پشووم تەرخان کرد بۆ نووسینی نامەیەکی شانزە پەڕەیی بۆ کاك سەروەتی هاوڕێم لە ئەڵمانیا، کە زۆر لایەنی خەمی دووردوڵاتیی خۆمانم تێدا باسکردبوو، نامەکە لەوێ ئەویشی خستبووە گریان، کەچی کاتێ هاتمەوە نەمدەتوانی لە پەڕەیەك زیاتر بۆ برادەر و دۆستەکانم بنووسم و ئەوەش خەم و خەفەتی ئەوتۆی تێدا نەبوو، تومەز ئەمە بۆ حاڵی خۆم دەگریام!

کاتێ لەوێ بووم هەواڵێکی بەسوێ و جەرگبڕم پێگەیشت کەوا پێشمەرگەیەکی خزمم پاش ساڵانێکی دوورودرێژی پێشمەرگایەتی لە شەڕی نەگریسی ناوخۆدا شەهید بووە. کاریگەریی ئەو هەواڵە و ئاوێتە بوونی بە باری دەروونیی سەختی خۆم بوو بە نامەیکی شەش حەوت لاپەڕەیی بۆ برایەکی لە نەمسا و لەوێ ئەویشی خستبووە کوڵی گریانێکی بەجۆش، هەرچەندە زانیبووشی کەوا هەواڵەکە ڕاست نیە و خێرا تەلەفۆنی بۆ کردم. دواتر کە هاتمەوە بە پێشمەرگەکەم وت خەیاڵ نەکەیت، ئەمجارە ئەگەر لە سەنگەری بەرەنگاریی دوژمنیشدا شەهید بیت هەرگیز ناتوانم دەربڕینێکی وەك ئەو کاتە بخەمە سەر کاغەز!

# هەندێك دیاردە و خاسییەت لە ئەمەریكادا

ئەوە چەندین سەدەیە لەو تێكەڵە كولتووری و ئەتنیكییە پرۆسەی گەڵاڵەبوونی میللەتێك لە گەڕدایە بە ناوی میللەتی ئەمەریكاوە و سەرجەمی كۆچبەرانی نەتەوە جۆراوجۆرەكانی سەر زەوی بە ڕەنگ و ڕوخساری جیاجیایانەوە بەشداری ئەو پرۆسەیەن و كەسیان لە ڕەگی خۆیان دانەبڕاون بەڵام لە هەمان كاتیشدا نەتەوە یان گەلێكیان لێدێتە ئاراوە كە پێگەی ئابووری - جوگرافی - مێژوویی - كولتووریی خۆی هەیە، ئەویش گەلی ئەمەریكایە و هەمەچەشنیی زمان و فەرهەنگ و نەژاد و ئاین و مەزەب مۆركێكی تایبەتی داوەتێ و نەبووە بە كۆسپ لەو پرۆسەی ئاوێتەبوونەدا. لەوێ دژوارییەك نیە لەوەدا كەوا ئەمەریكییەك كورد، عەرەب، ئینگلیز، فەرەنسی، سكەندەناڤی، چینی، ڕووس، تورك بێت و لە هەمان كاتیشدا ئەمەریكی بێت و دەستوور و یاسا و ڕێسایەكی تۆكمە و مەحكەم ژیانی هەمووانی ڕێكخستووە و هەموو كەس وەك یەك بەرپرسە بەرانبەر بە یاسا و ئەحكامەكانی.

لەو وڵاتەدا خەڵك ئازادە ڕەگەز و ئاین وتەنانەت ناوی خۆیشی بگۆڕێت و ئەمەش نەنگی نیە بۆ كەس. ئەوەی كە سەرنج دەدرێ ئاسیاییەكانی ڕەگەزی زەرد یان چاوتەسك وەك چینی و ژاپۆنی و كۆری و ڤیتنامی كە ناوی یەكەمیان سێ برگەیە و كولتوورە ڕۆژئاواییەكە بە ئاسانی بۆی گۆ ناكرێت و پێی ئاشنا نیە، ئەمانە دەیكەنە ناوی ڕۆژئاوایی وەك جاك و كاسی و شتی لەم جۆرە. هەندێ خەڵكی نەتەوەكانی تریش بە ئارەزوو ناوی خۆیان دەگۆڕن. بۆ نموونە كەسێكی سووریم دەناسی ناوی میكائیل بوو كردبووی بە سام، كچێكی تورك لە بیرلنگتن كاری دەكرد ناوی موكەڕەم بوو كردبووی بە موكێ. هەر لە هەمان بازاڕدا پیاوێكی ئەرمەنی بە ڕەچەڵەك خەڵكی ئورفە ناوی موراد بوو و كردبووی بە مایك. ئەم پیاوە لایەكی ئەو بازاڕەی بە كرێ گرتبوو و كردبووی بە زەڕنگەری. مایك بەینی لەگەڵ من خۆش بوو وهەمیشە لەگەڵ كوڕێكی ئامۆزایدا خۆیان وا لە قەڵەم دەدا كە خزمی كوردن، هەرچەندە لای ئەرمەن وا كەوتووەتەوە كە كورد لە سەرەتای سەدەی بیستدا قڕیان تێخستوون و لەم سۆنگەیەوە گەلێكیان حەز لە كورد ناكەن. ئەو ناو گۆڕینە هەندێ كوردیش كردیان. ئەوەی كە زۆر سەرسامی كردم لەو وڵاتەدا كەس لە ڕەگەز و ئاینی كەس [illegible]ێت و لە شوێنێكدا چوار كەسی تێدا بێت بە دەگمەن ڕێدەكەوێت دوانیان

خەلکی ولاتێك بن. لە پەیوەندیی کۆمەلایەتیدا ئەو کەسانەی بە ئەسل خەلکی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست، ولاتەکانی ئەمەریکای لاتین و تاراددیەکیش ئەورووپان زیاتر کراوەن و تێکەلی یەکتر دەبن. کەچی ئاسیاییەکان زۆر داخراون و پەیوەندییان لەگەل کەس نیە و بەردەوام وەك مێرووله دەجوولێن و سەرقالی کارن، هندییەکانیش بەزۆری چاوبرسی و پیسکەن. مەکسیکییەکان لە ولاتێکی کاول و بێدەرامەتەوە هاتوون و زۆربەی کاری قورس ئەوان دەیکەن. ڕەشپێستەکان دوو جۆرن ئەوانەی بەشێکن لەو ولاتە و کاتی خۆی باو باپیرانیان لە ئەفەریقا لە لایەن بازرگانی سپیپێستەوە ڕاوکراون و بە کەشتی گوێزراونەتەوە بۆ ئەمەریکا و کراون بە کۆیلە ، کە ئەمە لە مێژوودا بازرگانی کۆیلەی پێدەوترێ. لە ئەمەریکا ئەمانە زۆر دلڕەقانە چەوسێنراونەتەوە و خراونەتە بەرکاری قورس و جیاوازیی زۆریان لەگەل کراوە. ئەمانە ئێستا ژمارەیان دەگاتە ٣٠ سی ملیۆن کەس لە ئەمەریکادا و هەرچەندە ئێستا لە ڕووی یاساوە هاولاتیان وەك یەك تەماشا دەکرێن بەلام هێشتا گرێ و گۆسالی دەروونیی کۆن هەرماوە و گەلێکیان هەر دلیان کرمێیە لە سپیپێست و تا ئێستاش ڕەشەخەلکەکەیان کاری باشیان وەك پێویست دەست ناکەوێت. ئەمانە لە ئەنجامی ئەو ستەمە مێژوویەوە و نەڕەخساندنی دەرفەتی خوێندن و کاری باش گەلێکیان لادەر و تەمەل و چەقاوەسوو و بەدڕەفتارن. هەرچەندە گەلێکیشیان دۆستم بوون، بەلام بەداخەوە زۆربەی تاوان و دزی و گزی لەمانەوە سەرچاوە دەگرێت.

دەزگای پۆلیس لەم ولاتەدا زۆر بەهێزە و بە وردی لە کێشە و گرفت دەپێچێتەوە و ئاسایش دەپارێزێ و دەزگایەکی پڕ بە پێستی ئەرکەکەی هاوکاری خەلکە و ئەگەر پۆلیس نەبێت هێندە تاوان زۆرە پیاو پیاو دەخوات. لێرە بنکەی پۆلیس پێی دەوترێ شەریف و تەلەفۆنی پۆلیس لە هەموو شوێنێکی ولاتەکەدا 911 یە و بە ناین وان وان گۆ دەکرێت و تەنانەت ئەگەر مندالێش ئەو ژمارەیە لێبدات و تەلەفۆنەکە دانەخاتەوە و هەر ئەوەندە بلێ فریام بکەون help دەسبەجێ شوێنەکەی دەسنیشان دەکەن و دەگەنە سەری. ئەلبەتە پۆلیس ڕۆلی ڕێکخستنی هاتوچۆش دەبینن ئەگەرچی تەواوی ڕێگاوبان نیشارەتی ترافیکە و کەسێك نیە ناوی پۆلیسی هاتوچۆ بێت و لە چوارڕێیان و شوێنی وادا بوەستێ، بەلام هەر شۆفێرێکیش سەرپێچی بکات خێرا لە سەری حازر دەبن وەك ئەوەی موویان بۆ هەلکرووزابێت وایە. تابلێی ڕێگاوبان پان و فراوانە و دوو سایدە و هەر سایدەی چوار ڕیز یان لەین ئۆتۆمبێلی پێدا دەڕوات. هەندێ جادە بنکە و بەربەستێکی لە سەرە و تا پەنجا سەنت نەخەیتە ئامێرێکی ئەلکترۆنییەوە بەربەستەکە بەرز نابێتەوە و ئەم پارەیەش بۆ پرۆژەی خزمەتگوزاریی ڕێگاوبان تەرخان دەکرێت.

تۆ دەتوانی سەرانسەری ئەمەریکا بگەڕێی بە پێی نەخشەی تایبەتی و نەگۆڕی ڕێگاوبانەکانی وڵات و بۆ هەر شارێکیش بچیت دەتوانی نەخشەی وردی شەقامەکانیت دەست بکەوێت بە ژمارە و ئیشارەتی چەسپاوی خۆی و تا بەردەرگای ئەوماڵەی بۆی دەچیت پرس بە کەس نەکەیت!

لەوێ چەند ساڵێك بە سەر مۆدێلی ئۆتۆمبیلدا تێپەڕێت ئیتر زۆر هەرزانە و نرخی بەنزینیش تۆڵەکەیە و کاتێ لەوێ بووین باشترین جۆری بەنزین لیتری لە ٢٢ سەنت تێنەدەپەڕی، بەڵام بە پێی بەرزبوونەوەی نرخی نەوت ئێستا گرانتر بووە و تەنانەت لەم ماوەیەدا نرخی لیترێك لە پەنجا سەنت پێپەڕی. ڕووداوی ڕێگاوبان زۆر کەمە لەبەر فراوانی جادە و پابەند بوونی تەواو بە یاسا و ڕێسای هاتوچۆوە. بەزۆری هەرکەسە و ئۆتۆمبیلی خۆی هەیە و لە پاڵ ئەوەشدا پاس و مەترۆ و شەمەندەفەریش هەن. لە ئەتلەنتا مەترۆکە وەك تۆڕێك باکوور- باشوور و ڕۆژهەڵات – ڕۆژئاوای دەگرتەوە.

لەوێ بازاڕی خواردن و پۆشاك و هەموو شتێك لە ململانێ و پێشبڕكێی یەکتردان بۆ ئەوەی بەردەوام جۆری شتەکانیان باش بێت و نرخیشیان گونجاو بێت. لە بازاڕی خواردەمەنی و سەوزە و میوەدا چوار وەرزە هەموو شتێکت دەست دەکەوێت و بە ئارەزووی خۆت شتەکان هەڵدەبژێریت. لە ڕۆژوێل بازاڕێك هەبوو بە ناوی (هەریس فارمەر مارکت H arry's farmer M arket) بەردەوام شتی تەڕ و تازەی دەخستەڕوو، ڕۆژانە بە لۆری میوە و تەماتە و سەوزەی کەمێك شکاو و ژاکاوی فڕێدەدا بۆ ئەوەی ناوبانگی بازاڕەکەی هەمیشە بە بەرزی بهێڵێتەوە. لە گەلێکی ئەو بازاڕانە میوەی جۆراوجۆر دانرابوو کە دەتتوانی بەخۆڕایی لێیان بخۆیت و تامیان بکەیت پێش کڕین.

هەموو شارێك کتێبخانەیەکی دەوڵەمەندی تێدابوو کە ناسنامەیەکی تایبەتیان بۆ دەکردی بۆ هاتوچۆی کتێبخانەکە و چۆنێتی خواستنی کتێب و بۆ هەموو تەمەنەکان شوێن جیاکرابووەوە. لەوێ دەزگایەکی بازرگانیی گەورەی کتێبفرۆشی هەیە بە ناوی (بارنز ئەند نۆبڵ Barns & Noble) لە سەرانسەری وڵاتدا لقی هەیە و هەموو جۆرە کتێب و چاپەمەنییەکیان هەیە بە جوانترین بەرگ و چاپەوە.

لە ئەمەریکادا نزیکەی پانزە سەیرانگای سەرەکیی سروشتی هەیە کە پێیاندەوترێ پارکی نیشتمانی (ناشناڵ پارك National parks) و هەریەکەیان ڕووبەری ٨٠ – ٩٠

کیلۆمەتر چوارگۆشەیە و تەواوی ڕووەکی سرووشتی و ئاژەڵی کێوی و دەریاچە و هەموو شتێکی تێدایە و هەموو ئاسانکارییەکی حەوانەوە لەخۆدەگرێت.

پۆستە و خزمەتگوزاریی پۆستە زۆر پێشکەوتووە و بەردەوام خەڵك لە ئۆفیسەکانیدا ئاپۆرەیان داوە و هەر کەسە لە گەڕەکەکەیدا سندووقێکی پۆستەی خۆی هەیە و ڕۆژانە بەریدی بۆ دێت و موعامەلاتیش بە زۆری لەوێوە ڕایی دەکرێت ودەرهێنانی پاسپۆرتیش هەر بە پۆستە و لەوێشەوە بۆت دێتەوە. ئەمەش ڕۆڵی باشی خۆی هەیە لە نەهێشتنی ڕۆتینیدا. لە ڕووی تەلارسازی و بینای هەور بڕەوە لەو وڵاتەدا کاری موعجیزە ئاسا دەبینی. لە ئەتلەنتا دوو بینای دەستە خوشك Twin Towers هەبوون زۆر بەرزبوون ویەکێکیان لە لووتکەکەیدا مەلیکی شەترەنج و ئەویتری وەزیری شەترەنج چەسپکرابوو، بێگومان بە قەبارەی بیناکە خۆی.

ئەوەی زۆر سەرنجی ڕاکێشام ئەوە بوو کە هەموو شوێنێکی ئەو شارەی تێیدا بووم کرابوو بە سەوزی و گوڵ و لێژاییەکانیش بە دارکاژی هەمیشە سەوزی خشۆك و ڕووبەری پان و بەرینی چیمەن کە بەردەوام کرێکاریان لە سەر بوو بە یەدلە و دەمامکی تایبەتەوە و بە مەکینەی چیمەنبڕ سەرقرتیان دەکرد.

خەڵك لەوێ زۆر ئارەزووی کاری خۆبەخشی دەکەن. خەڵك هەیە مامۆستای خانەنشینە و دەچێ بە خۆبەخش لە قوتابخانەیەك دەرس دەڵێتەوە یان لەگەڵ منداڵدا دەچێ بۆ گەشتی زانیاری. لە هەموو دامودەزگایەکدا بەردەوام خەڵکێك دەبینی بە خۆبەخش کاردەکەن، بە تایبەتی ئەو ئافرەتانەی مێردەکانیان دەوڵەمەندن یان کاری باشیان هەیە و ژنەکان ئیش ناکەن. لە سەر پارچە زەوییەکی نێوان هەردوو شاری ڕۆزوێل و ئەلفەرێتا کە تێکەڵی یەکتر بووبوون و هەردوك میترۆپۆلیتانی ئەتلەنتای گەورە بوون، دانیشتوان لە ماوەیەکی کورتدا شارێکی یاریی منداڵانیان دروستکرد بە کارکردن و کەرەستە و تفاقی خۆیان و هەر یەك بە پێی توانا و مەچەك چەرخانی خۆی بەشداریی تێدا کرد و حکومەت هەر هەقیشی بە سەرەوە نەبوو ئەوە نەبێ کە دواتر شاردوانیی ئەرکی ئیدامە و بەڕێوەبردنی لەئەستۆ گرت.

لەو وڵاتەدا کەنیسە بە تەنها شوێنێك نیە بۆ نوێژی یەکشەممان، بەڵکو دەزگایەکە هەموو جارێك پیتاك لە ئەندامانی کۆدەکاتەوە و کاری کۆمەڵایەتیی ویارمەتیی مرۆڤدۆستی پێ ئەنجامدەدەن لە دەرەوەی وڵات و بە تایبەتی بۆ شوێنی کارەستباری سیاسی و سروشتی.

لەوێ هەر جلێکت پۆشیبێت کەس تەماشات ناکات. لە ناشڤیلّ گەلیّ کورد بە ڕانك و چۆغە و جامانەوە ئۆتۆمبیلیان لێدەخوڕی و کەس هەر تەماشاشی نەدەکردن. بە هەمان شێوە نیوە ڕووتیش بە کەس سەرنجت ناداتێ. بەڵام بە گشتی خەڵکی ئەمەریکیی سپیپێست زۆر ڕێکپۆشن بە ژن و پیاویانەوە، بە پێچەوانە خەڵکە ڕەشپێستەکەوە کە بەردەوام جلی نارێك و نەگونجاویان دەپۆشی، بەزۆری پیاوانیان و بە تایبەتی گەنجەکانیشیان کە بە تەواوی سیمای بەرەڵاییان پێوە دیاربوو، کەچی لە گەڵ ئەوەشدا گەلێکیان کچە هاوڕێیەکی جوان و سپیپێستیان لەگەڵ بوو!

کەسم نەبینی لەوێ دەم لە سیاسەت بدات، چەشنی خەڵکی لای خۆمان. کەسم نەبینی لەوێ ببێتە دەروێشی حیزب و هەر هەق و ناهەقێك حیزب بانگەشەی بۆ بکات ئەمیش تووتی ئاسا بیڵێتەوە و غەیری حیزبەکەی خۆی کەس بە ڕاست نەزانێت. کەسیشم نەبینی بە کۆماری و دیموکرات خۆی بناسێنێ و ئەگەر جیاوازییەکیش هەبێت لە وردەکاریی بەرنامەکانیاندایە لە بارەی مندالّ لەباربردن و باج و سۆشیالّ و شتی لەم جۆرە.خەڵك لەوێ ئەوەندە حکومەت ناناسێ و زۆریش کاری پێ نیە و بگرە ڕێژەیەکی زۆریشیان لە هەڵبژاردنی سەرۆکایەتیشدا بەشداری ناکەن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کەسێکم نەبینی سەرزارەکی قسە بە سەرکردە یان سیاسییەکی وڵاتەکەی بڵێت و دایشۆرێ، مەسەلەکەی کلینتۆن و مۆنیکا نەبێت کە لە ڕۆژنامە و تەلەفزیۆنەوە ئابڕوویان بردبوو، دەنا کەس بە دەمی هیچ قسەیەکی نەدەکرد. لە ڕووی شەخسیشەوە کەسم نەبینی بە خراپە باسی کەسی تر بکات و زەمی بکات و ئەگەر زۆر لێی ناڕازی بوایە باسی نەدەکرد. هەر لەو گرووپە ژنەی کەنیسەی سانت دیڤیدی شاری ڕۆزوێلّ کە ماوەیەك بە دەم ئێمەوە بوون سوزانێکیان تێدابوو جار بە جار ڕەفتاری لەگەڵ ئێمە باش نەبوو و قسەی بێمانای دەردەفرتاند و ئەوانیش و ئێمەش زۆر لێی ناڕازی بووین و تەنانەت من نەمویست بێت بەلاماندا و قسەم پێ وت کەچی ئەوان دڵی منیان دەدایەوە و زەمی ئەویشیان نەدەکرد. ئیتر نازانم ئەوانەی پابەندی تەواوی ئاینی مەسیحین ئاوهان یان ئەوە ڕەوشتێکی کۆمەڵایەتییە. بەهەرحالّ، هەر کامێکیان بێت شتێکی باشە و ئێمە ئاسا نین هەر کەسێکمان بەدڵ نەبێت درێغی ناکەین لە زەمکردن و داشۆرینی و ئەگەر بۆشمان بکرێت زیان پێگەیاندنیشی. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو وڵاتە مێژوویەکی زۆر کۆنی نیە بەڵام هەر شتێك لەم نزیکەی سێ سەد ساڵەی تەمەنیدا بنیات نرابێت پارێزراوەو بایەخی خۆی پێدراوە. دەبێ ئەوەش بزانین کە نزیکەی دوو سەدە و چارەکێکە جاری سەربەخۆیی خۆی

داوه. یەك لەوانەی زۆر بەرچاوە داتاشینی پەیکەری چوار سەرۆکی ناوداری ئەو ولاتەیە لە شاخێکی زەبەلاح و بە شێوەیەك کە تەماشای ددکەیت وا دەزانی شاخەکە کەللەسەری ئەوانن. ئەمانەش لە مێژووی ئەمەریکادا پێیان دەوترێ چوار سەرۆکە باوکەکەی ئەمەریکا، کە جۆرج واشنتۆن و تۆماس جێفەرسن و ئەبراهام لینکۆڵن و تیۆدۆر ڕووزڤلتن. پەیکەرەکان لە ویلایەتی داکۆتای باشوورن (دواتر کەمێك بە وردی باسی لێوە دەکەم).

جۆرج واشنتۆن ڕابەری ڕزگارکردنی ئەمەریکایە لە دەستی بەریتانیا. پێشتر ئەم ولاتە تەنها سیانزە ویلایەت بووە لە کەناری ئۆقیانووسی ئەتلەنتیك کە ئەمانە بوون: ماساچوسێتس، نیوهەمپشایەر، نیویۆرك، ڕۆد ئایلاند، نیوجێرسی، ڤەرجینیا، پێنسلڤانیا، کارۆلینای باکوور، کارۆلینای باشوور، جۆرجیا، دیلاوێر، مێریلاند و کۆنێکتیکەت. لە پاش بێنە و بەرە و ملنەدان بە فەرمانەکانی پاشای بەریتانیا لە ٤ ی تەمووزی ۱۷۷٦ دا ئەم ویلایەتانە جاڕی سەربەخۆییان داوە و فەرەنسای ئەو سەردەمە کە دوژمنی بەریتانیا بووە زۆری پشتگیری لێکردوون و جۆرج واشنتۆنی سەرکردەی گەل و داکۆکیکار لە مافەکانی کراوە بە سەرۆك و هەر لەو دەمەوە دەستوورێکیان بۆ سەرۆکایەتی و بەڕێوەبردنی ولات داناوە کە تا ئێستاش کاری پێدەکرێت. پاشان پایتەختیان لە شاری فیلادڵفیای باکوورەوە گواستەوە بۆ ئەو شارەی ئێستا پێی دەوترێ واشنتۆن و لە بەر گەورەیی و خەباتی جۆرج واشنتۆن ناوی ئەویان لێنا. ئەڵبەتە ئەو ددمە هەر یەکە لەو سیانزە ویلایەتە دەیویست پایتەخت لە خاکی ئەودا بێت و ئەوانیتر پێی ڕازی نەدەبوون و ئەنجام ئەم شوێنەی ئێستای شارەکەیان هەڵبژارد کە لە موقاتەعەی کۆڵۆمبیادا بوو و سەر بە هیچ ویلایەتێك نەبوو، بۆیە ئێستا پێیدەڵێن واشنتۆن دی. سی Washington D.C یە کە کورتکراوەی District of Columbia واتە ناوچە یان موقاتەعەی کۆڵۆمبیا. شایانی باسە ئێستا لە باکووری ڕۆژئاوای ئەو ولاتە ویلایەتێکیش بە ناوی واشنتۆن هەیە و پایتەختەکەی سیاتڵە Seattle.وەك پێشتریش باسم کرد سیستەمی ڕێگاو بان و پرد و تونێل بە تۆڕێکی چڕوپڕ ویلایەت و شارەکانی بە یەکترەوە بەستووە و باوەڕ ناکەم لە هیچ شوێنێکی تری سەر ئەرزدا ڕێگاو بانی هێند پان پۆڕ هەبن. بێجگە لەوە زۆربەی شارەکان فڕۆکەخانەی تێدایە و بە زۆری هاتوچۆی ویلایەتە دوورەکان هەر بە فڕۆکەیە و من لەوێ سێ فڕۆکەخانەم بینیوە لە شارەکانی سان فرانسیسکۆ و هیوستن و ئەتلەنتا کە هەر یەکەیان شارێکن بۆ خۆی و فڕۆکەخانەی هاوای و گوامیش تاڕادەیەك گەورە بوون بەلام نەدەگەیشتنە گەورەیی ئەم سیانەدا.

لێره خاكی بە پیت و ئاوی زۆر و سەرچاوەی سروشتیی سامان بەر دەست و ئەقڵی كارامەی مرۆڤ كەوتوون و سیستەمێكی ئابووری و سیاسی و دیموكراتی لە گەڵ سەرەوە پەیوەندی و بەكارهێنانی ڕێكخستووە و سەرەنجام شارستانیەتێكی گەورە و گەشەكردووی لێ گەلاڵە بووە. ڕاستێكەی شارستانێتێكە مرۆڤ لێی سەرسامە و هەموو كەس دەخوازێ وڵاتی خۆی بەو ڕادەیە پێشبكەوێت و خەڵكەكەی بەری ڕەنجی خۆی بخوات و سیستەمێكی سیاسی - ئابووریی تێدا بەرقەرار بێت كە چیتر جەردە و مفتخۆر نەتوانن بەو ڕەهاییە تاڵانی بكەن. بەڵام، وەك لە گەڵ شوێنی پێشتردا باسم كردووە، ئەوە نەبێ ئەم وڵاتە، وەك پەندە كوردییەكە دەڵێ، شامی شەریف بێ و دەرد و سەرئێشەی خۆی نەبێت، كە هەندێكیان كوشندەیە و ڕەنگە كایگەریی سەختیان لە ئایندەیەكی دوور یان نزیكدا دەربكەوێت. ئەڵبەتە ئێرەش بەشی خۆی دەردی ئابووری و كۆمەلأیەتی هەیە. ڕاستە كەس لە برسا نامرێت و سیستەمێكی ئەمانی كۆمەلأیەتی هەیە بەڵام هەژاریش هەیە. ئەگەر پۆلیس نەبێت دز و پیاوخراپ چاوی پیاو دەردێنن و وڵاتەكە دەبێتە جەنگەڵستان، بەڵام پۆلیس لەو وڵاتە چاو لە خەڵك سوور ناكاتەوە و بە نەرمی ڕەفتار دەكەن و ئەحكامەكانی یاسا جێبەجێ دەكەن.

بەلای منەوە ئەم وڵاتە بە دەست هەندێك پەتای كۆمەلأیەتیی كوشندەوە گرفتار بووە و كاریگەریی زۆری دەبێت لە سەر ئایندەی. لێره سیستەمی خێزان خەریكە شیرازەی دەپسێت و منداڵێكی زۆری دایك دیار و باوك نادیار لەو كۆمەڵگایەدان لە ئەنجامی نەریتی بۆی فرێند و گێرل فرێند girl friend & boy friend و منداڵ خستنەوەی دەرەوەی پەیوەندیی ژن و مێردایەتی. ژمارەی جیابوونەوەی ژن و مێرد زۆر بەرچاوە و بێگومان كاریگەریی سەختی خۆی هەیە لە سەر منداڵ. پەتای ئەیدز بەجۆرێك تەشەنەی كردووە كەوا خەریكە هەموو شتێك لە گرێژەنە دەبات و سەرەڕای پشكنینی پزیشكی و دەرمان و كۆندۆم هەرچییەك دەكەن زەوتی ناكەن و خەڵكی وڵاتەكە زیرەیان كردووە و تەنانەت مەسەلەكە كێشاوێتیەوە بۆ پەیوەندیی نێر و مێ و سەرباری ئەمانی ڕۆمانسیەت لە پەیوەندیی سۆزداریی ژن و پیاودا ئێستا پەیوەندیی بایۆلۆجی و سێكسی هەزار حیسابی بۆ دەكرێت و چنگی ڕەشی ئەیدز لە زەینی هەموو كەسێكدا ئامادەیە.

بەنگكێشان و مادەی سڕكەر یان بێهۆشكەر drug ئەمڕۆ لەو وڵاتە بەجۆرێك بڵاوە و بە تایبەتی لە ناو خەڵكی گەنجدا، كە لە باسكردن نایەت و وڵاتەكە گەورەترین بازاڕە بۆ

تۆڕ و باندەکانی بازرگانی کردن بەو مادەیەوە و باندەکان لەوپەڕی چالاکیدان بۆ گواستنەوەی تلیاك لە ولاتانی ئەمەریکای لاتین و شوێنی تردوە بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان. هەرچی هێزی پۆلیسی ولاتەکەشە بەردەوام لە ڕاوەدوونانیاندایە و چاریان ناکەن.

ڕەشەخەلکە بەردەوام لە ڕاکەڕاکەی کارکردن و کار پەیداکردنداندان و هەرچەند دەکەن فریای دابینکردنی بژێوی ناکەون و ئەمەش کاری نێگەتیفی کردووەتە سەر ئاسوودەیی و ژیانی ڕۆحیی خەلك و پەراوێزێك نەماوەتەوە بۆ هەناسەدان و پشوویەك. لەبەر ئەوە دەبینی خەلکی ولاتەکە دەرفەتی ئەوەیان نیە سەری خۆیان بخورێنن و کتێبێك بخوێننەوە، سەرباری زۆریی کتێبخانەش. تەنانەت زۆربەی خەلك لە ڕۆژنامەکاندا هەر لاپەرەکانی کاردۆزینەوە دەخوێننەوە. لەبەر ئەمانە و ڕەنگە کاریگەریی لایەنە سەلبییەکەی گلۆبالێزم Globalism (عەولەمە) بێت کەوا کۆمەلانی خەلکی ئەو ولاتەی دەبەنگ کردووە و سەرباری بەرهەمە زۆرەکانی گلۆبالێزم لە سەتەلایت و ئینتەرنێت و تەلەفۆن و گەلێ شتی تر کەچی تاڕادەیەکی زۆر بێئاگان لە ڕووداوەکانی دنیا و بگرە چواردەوری خۆشیان.

بێگومان ئەم بارەش کێشاوێتیەوە بۆ ئاکار و هەلسوکەوتی ئەمەریکا لە سیاسەت و پەیوەندیی نێودەولەتیدا و ئەمڕۆ هێندەی ئەمەریکا هەلە و ڕەفتاری ناپەسەند و ملهوڕانە دەنوێنێ لەو بوارەدا هیچ دەولەتێکی تر نایکات. ئینگلیز ڕایان لە سەر ئەمەریکییەکان زۆر خراپە و دەلێن ئەمەریکا لە پەیوەندی و سیاسەتدا ڕاست و چەوت بەکاردێنێ و هەلە لە دوای هەلە دووبارە دەکاتەوە و هەرچییەك دەکات هەر چەوت دەردەچێت و کورتی دەهێنێ ئەنجام پاش تاقیکردنەوەی هەموو هەلە و چەوتییەکان کاتێ ڕاستەکە تاقی دەکاتەوە کەوا کەلکی نەمابێت.

# باسێك لە هەرێمی کۆڵۆمبیا و شاری واشنتۆن دی . سی

لە ساڵانی سەرەتای ١٧٠٠ ەکانەوە کەڵکەڵەی جیابوونەوە لە تاجی بەریتانی کەوتبووە سەر خەڵکی وڵاتەکە و سەرکردەکانی و فەرەنساش کە ئەو دەمە دوژمنی خوێنخواری ئینگلیز بوو بەردەوام دنەی دەدان و پشتگیری دەکردن. ئەمەریکییە سەربەخۆیی خوازەکان لەوە دڵنیا بوون کە زۆر ناخایەنێ بەری ڕەنج و خەباتی خۆیان دەخۆن و لە ژێر ڕکێفی پاشای بەریتانیا دەردەچن. هەر لەو سەردەمەشەوە بیریان لە شوێنێك دەکردەوە کەوا شارێکی تێدا دروست بکەن ببێتە پایتەختی حکومەتی داهاتوویان و لە هەمان کاتیشدا نەکەوێتە ناوجەرگەی هیچکام لەو ١٣ ویلایەتەوە کە ئەمەریکای ئەو سەردەمەی لێ پێکهاتبوو بۆ ئەوەی هیچکامیان پاشەڕۆژ زاڵ نەبن بە سەر ئەوانیتردا. هەروەها دەشبوو لە شوێنێکی ناوەڕاستدا بێت و بە ئسانی لە هەموو ویلایەتێکەوە هاتەچۆی بکرێت. ئەم خاڵانەی خوارەوە کرۆنۆلۆجیای هەندێ ڕووداوی گرنگە لە مێژووی هەرێمی کۆڵۆمبیادا District of Columbia کە ڕووناکی دەختە سەر قۆناخەکانی دروستکردنی شاری واشنتۆن و کردنی بە پایتەختی ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ساڵی ١٨٠٠ دوە، پاش ئەوەی ساڵی ١٧٧٦ جاڕنامەی سەربەخۆیی ڕاگەیاند و بە شێوەیەکی کاتی شاری فیلادلفیا، لە ویلایەتی نیوجێرسی، کرا بە پایتەخت و دواتر گوێزرایەوە ئەم شوێنەی ئێستای.

- ١٥ ی ١٧٥١: ئەنجومەنی مێریلاند ئەندامانی ئەو نێردەیەی دەسنیشان کرد بۆ دروستکردنی شارێك لە سەر ڕووباری پۆتاماك Potamac ، لە ناوچەی ڕۆك کریکی هەرێمی کۆڵۆمبیادا، لە سە ڕووبەری ٦٠ ئەیکەر زەوی، کە بڕیار بوو لە جۆرج گۆردن و جۆرج بیلیی بکڕن. ئەم نیشتەجێیە ناونرا جۆرجتاون Georgetown .
- ٢٧ ی شوباتی ١٧٥٢: ڕووپێوکردن و نەخشەکێشانی جۆرجتاون ئەنجامدرا.
- ١٧ ی سێپتەمبەری ١٧٨٧: ئیمزا کردنی دەستوور لە لایەن ئەندامانی لیژنەی گەلاڵەکردنی دەستوورەوە.
- ٢١ ی حوزێرانی ١٧٨٨: موسادەقە کردنی ویلایەتەکان لە سەر دەستوور. بەندی ١، بەشی ٨، بڕگە ١٧ ی دەستوورەکە دەسەلاتی بە کۆنگرێس دا بۆ ڕاییکردن و بەدواداچوونی ئەو یاسایانەی پەیوەندییان بەم هەرێمەوە هەیە، کە لە ویلایەتەکانی دەورپشتی دابڕێت و کۆنگرێس قوبوولی بکات ببێتە بارەگای ویلایەتە یەکگرتووەکان.
- ٢٤ ی کانوونی دووەمی ١٧٩١: سەرۆك جۆرج واشنتۆن جێگەیەك هەڵدبژێرێت کە بەشی هەردوو ویلایەتی مێریلاند و ڤەرجینیای تێدابێت.
- ١ ی دیسەمبەری ١٨٠٠: پایتەختی حکوومەتی فیدراڵی لە شاری فیلادلفیاوە گوێزرایەوە بۆ ئەو شوێنەی لە سەر ڕووباری پۆتاماك بنیاتنرا و ناویان لێنا شاری واشنتۆن

له موقاتەعە یان هەرێمی کۆڵۆمبیا Washington D.C. لە سەرژمێرییەکی ساڵی ١٨٠٠دا، دانیشتوانی ئەم پایتەختە تازەیە: ١٠٠٦٦ سپیپێست و ٧٩٣ ڕەشپێستی ئازادکراو و ٣٢٤٤ ڕەشپێستی کۆیلەی تێدابووە.

- ٣ ی مایسی ١٨٠٢: کۆنگرێس یەکەم ئیمتیازی شارەوانیی بەخشییە شاری واشنتۆن. دەنگدەرانی نێرینەی سپیپێست لەوانە دەسنیشان کران کە باجیان دەدا و لانی کەم پێش ساڵێك نیشتەجێی شار بوویێتن. ئەمانە مافی هەڵبژاردنی ئەنجومەنێکی ١٢ کەسییان هەبوو کە ئەمانیش حاکمی شاریان هەڵدەبژارد.
- ٤ ی مایسی ١٨١٢: کۆنگرێس دەستووری شاری واشنتۆنی هەموار کرد بۆ هەڵبژاردنی ئەنجومەنێکی پیرانی ٨ کەسی و ئەنجومەنێکی گشتیی ١٢ کەسی، کە هەردوولا پێکەوە حاکمی شار هەڵدەبژێرن.
- ١٥ ی مارتی ١٨٢٠: کۆنگرێس دەستووری شاری واشنتۆنی هەموار کرد بۆ هەڵبژاردنی حاکمی شار ڕاستەوخۆ لە لایەن دانیشتوانە دەنگدەرەکانەوە.
- ٩ ی تەمووزی ١٨٤٦: کۆنگرێس یاسایەکی دەرکرد سەبارەت بە گەڕانەوەی شار و ناوچەی ئەلێکساندریا بۆ ویلایەتی ڤەرجینیا.
- ١٦ ی نیسانی ١٨٦٢: کۆنگرێس کۆیلەیەتیی هەڵوەشاندەوە لەم هەرێمە فیدراڵەدا، کە بریتی بوو لە شار و کاونتیی واشنتۆن و جۆرجتاون.
- ٨ ی کانوونی دووەمی ١٨٦٧: کۆنگرێس مافی دەنگدانی ناوچەیی بەخشییە نێرینە ڕەشپێستەکان.
- ١١ ی حوزێرانی ١٨٧٨: کۆنگرێس موسادەقەی لە سەر ئەوە کرد کە حکومەتی ناوچەی کۆڵۆمبیا وەك دەستەیەکی شارەوانی سێ کەس حوکمی بکات کە لە لایەن سەرۆکەوە دەسەڵاتیان بدرێتێ: دوانیان مەدەنی و سێیەمیان لە پیپی ئەندازیاری سوپابێت. ئەم شێوە حکومەت کردنە تا ئابی ١٩٦٧ بەردەوام بوو.
- ٢٩ ی مارتی ١٩٦١: بیست و سێیەمین هەموارکردنی دەستوور مافی دەنگدانی سەرۆکایەتیی بەخشییە دانیشتوانی هەرێمەکە.
- ٢٢ ی نیسانی ١٩٦٨: مافی هەڵبژاردنی بۆردی خوێندن درا بە دانیشتوانی موقاتەعەکە.
- ٢٤ ی دیسەمبەری ١٩٧٣: کۆنگرێس ڕەزامەندیی دەربڕی لە سەر یاسای حکومەتی لۆکاڵی ڕێکخستنەوەی حکومەتی هەرێمی کۆڵۆمبیا کرد.
- ٢٢ ی ئابی ١٩٧٨: کۆنگرێس ڕەزامەندیی دەربڕی لە سەر هەموار کردنی مافی دەنگدان لە هەرێمی کۆڵۆمبیادا، کەوا مافی نوێنەرایەتی کردنی هەرێمەکە دەدات لە ئەنجومەنی سەنات و نوێنەراندا.
- ٢٠ ی شوباتی ١٩٨٧: هەردوو فرۆکەخانەی نیشتمانیی واشنتۆن و دالسی نێودەوڵەتی لە لایەن حکومەتی فیدراڵییەوە خرانە سەر حکومەتی هەرێمەکە.
- ١ ی ئۆکتۆبەری ١٩٨٧: نەخۆشخانەی سانت ئیلیزابێت چووە سەر حکومەتی ئەم هەرێمە.

  * ٢ی کانوونی دووەمی ١٩٩٢: شارۆن پرات دیکسۆن بوو بە یەکەم حاکمی ژن لە هەرێمە کەدا.

# چوار سەرۆکە باوکەکەی ئەمەریکا و چیای پەیکەریان

جۆرج واشنتۆن، تۆماس جێفەرسن، ئەبراهام لینکۆڵن، تیۆدۆر ڕووزڤڵت چوار سەرۆکی دیار و بەرچاون لە مێژووی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا و بە چوار سەرۆکە باوکەکەی ئەمەریکا ناودەبرێن و هەر یەکەیان لە پێچێکی مێژووی ئەو ولاتەدا ڕۆڵێکی گەورە و یەکلاکەرەوەی بینیوە و ناوێکی درەوشاوەیە لە مێژووی ئەو ولاتەدا.

- جۆرج واشنتۆن George Washington ١٧٨٩ - ١٧٩٧: ئەو سەرکردەیەی کە بە خەباتی بێوچان گەلی ئەمەریکای لە کۆلۆنیالیتیی بەریتانیا ڕزگارکرد و ساڵی ١٧٧٦ جاڕی سەربەخۆیی دا و بنەمای سیستەمێکی دیموکراتیی بۆ ئەو ولاتە دامەزراند کە تا ئەمڕۆش بەردەوامە.
- تۆماس جێفەرسن Thomas Jefferson ١٨٠١ - ١٨٠٩: بە زیری و پلانی ئەم سەرۆکە ساڵی ١٨٠٣ ئەمەریکا موقاتەعەی لویزیانای لە فەرەنسای سەردەمی ناپلیۆن بە ١٥ ملیۆن دۆلار کڕیوە، کە زۆری پێویست بە پارە و پووڵ بووە بۆ شەڕوشۆڕەکانی، واتە هەر ئەیکەرێك بە ٣ سەنت و ئەمە ڕێگەی فراوانخوازیی بۆ کردەوە بۆ ئەرکانساس، ئایوا، داکۆتای باکوور و باشوور، کەنساس، نبراسکا، میسوری، مینیسۆتا، ئۆکلاهۆما، تەکساس، نیومەکسیکۆ، کۆلۆرادۆ، وایۆمینگ و مۆنتانا.
- ئەبراهام لینکۆڵن Abraham Lincoln ١٨٦١- ١٨٦٥: لە شەڕی ناوخۆی ئەمەریکای ئەو ساڵانەدا ڕۆڵێکی گەورەی بینی بۆ ئەوەی ویلایەتەکانی باکوور و باشوور لێکتر جیا نەبنەوە و ولاتەکە بە یەکگرتوویی بمێنێتەوە.
- تیۆدۆر ڕووزڤڵت Theodore Roosevelt ١٩٠١- ١٩٠٩: نۆکەند یان کەناڵی پەنەمای دروستکرد، کە هەردوو ئۆقیانووسی ئەتڵەنتیك و پاسیفیکی بە یەکترەوە بەستەوە. ئەمیش وەك جێفەرسن ڕۆڵێکی گەورەی بینی لە فراوانخوازیدا بەرەو ڕۆژئاوای ئەمەریکا.

هونەرمەندی پەیکەرتاش گوتزون بورگلەم Gutzon Burglum لە نێوان ساڵی ١٩٢٧ و ٣١ ی ئۆکتۆبەری ١٩٤١ دا لەگەڵ ٤٠٠ کرێکاردا پەیکەرێکی نیودیی زەبەلاحی

۱۸ مەتری بۆ هەر یەك لەم چوار سەرۆكە داتاشی لە شاخی ماونت ڕەشمۆر Mount Rushmore ی ناوچەی بلاك هیلْ لە ویلایەتی داكۆتای باشوور، لە سەر ڕووبەری ۱۲۷۸ ئەیكەر یان ۵۱۷ كیلۆمەتری چوارگۆشە، بۆ نمایشكردنی یەكەم ۱۵۰ سالّی مێژووی ئەمەریكا. پەیكەرەكان لە چوار لووتكەی جیاكە داتاشراون، بە جۆرێك كە هەر لووتكەیەك بریتییە لە دەموچاوی یەكێك لەو چوار سەرۆكە لە گەلْ نیوەی لەشیدا و تەكنیك وهونەری پەیكەرتاشییەكی وردی تێدا بەكارهێناوە و لەو ماوەیەدا پێنجسەد هەزار تەن بەردی داتاشیوە. شیاوی باس ئەم شاخە یەكپارچە بەردی گرانیتی ڕەشە و هەمان هونەرمەند پێشتریش پەیكەری جەنەرالْ لی و هاوەڵەكانی لە ستۆن ماونتێنی جۆرجیا كێشاوە. تۆ بلّێی فەرهادی كۆكەنی كوردیش ئەم ڕەنجەی كێشابێت!

**سەرۆكەكانی ویلایەتە یەكگرتووەكان بە پێی سالآنی سەرۆكایەتییان ئەمانەن:**

١. جۆرج واشنتۆن ١٧٨٩ - ١٧٩٧
٢. جۆن ئادەمز ١٧٩٧ ١٨٠١
٣. تۆماس جێفەرسۆن ١٨٠١ ١٨٠٩
٤. جێمس مادیسۆن ١٨٠٩ ١٨١٧
٥. جێمس مۆنرۆ ١٨١٧ ١٨٢٥
٦. جۆن ئادەمز ١٨٢٥ ١٨٢٩
٧. ئەندرو جاكسۆن ١٨٢٩ ١٨٣٧
٨. مارتن ڤان بویرن ١٨٣٧ ١٨٤١
٩. ویلیەم هێنری هاریسۆن ١٨٤١
١٠. جۆن تایلەر ١٨٤١ ١٨٤٥
١١. جێمس پۆلْك ١٨٤٥ ١٨٤٩
١٢. زەكەری تایلۆر ١٨٤٩ ١٨٥٠
١٣. میلارد فیلْمۆر ١٨٥٠ ١٨٥٣
١٤. فرانكلین پیرس ١٨٥٣ ١٨٥٧
١٥. جێمس بوخانین ١٨٥٧ ١٨٦١
١٦. ئەبراهام لینكۆلْن ١٨٦١ ١٨٦٥
١٧. ئەندرو جۆنسن ١٨٦٥ ١٨٦٩

١٨. يولیسیس گرانت ١٨٦٩ ١٨٧٧
١٩. رەزەرفۆرد هایەس ١٨٧٧ ١٨٨١
٢٠. جێمس گارفیلد ١٨٨١
٢١. چێستەر ئارسەر ١٨٨١ ١٨٨٥
٢٢. گرۆڤەر کلێڤلاند ١٨٨٥ ١٨٨٩
٢٣. بنجامین هاریسۆن ١٨٨٩ ١٨٩٣
٢٤. گرۆڤەر کلێڤلاند ١٨٩٣ ١٨٩٧
٢٥. ویلیەم ماککینلی ١٨٩٧ ١٩٠١
٢٦. تیۆدۆر ڕووزفلت ١٩٠١ ١٩٠٩
٢٧. ویلیەم تافت ١٩٠٩ ١٩١٣
٢٨. وودرۆ ویلسن ١٩١٣ ١٩٢١
٢٩. وارن هاردینگ ١٩٢١ ١٩٢٣
٣٠. کالڤن کۆلیدج ١٩٢٣ ١٩٢٩
٣١. هێربەرت هووڤەر ١٩٢٩ ١٩٣٣
٣٢. فرانکلین ڕووزڤلت ١٩٣٣ ١٩٤٥
٣٣. هاری ترومان ١٩٤٥ ١٩٥٣
٣٤. دوایت ئایزنهاوەر ١٩٥٣ ١٩٦١
٣٥. جۆن کەنەدی ١٩٦١ ١٩٦٣
٣٦. لیندن جۆنسن ١٩٦٣ ١٩٦٩
٣٧. ریچارد نیکسۆن ١٩٦٩ ١٩٧٤
٣٨. جیرالد فۆرد ١٩٧٤ ١٩٧٧
٣٩. جیمی کارتەر ١٩٧٧ ١٩٨١
٤٠. ڕۆنالد ڕێگن ١٩٨١ ١٩٨٩
٤١. جۆرج بوش ١٩٨٩ ١٩٩٣
٤٢. ویلیەم کلینتۆن ١٩٩٣ ٢٠٠١
٤٣. جۆرج دبلیۆ بۆش ٢٠٠١ ئێستا

# بڕیاری گەڕانەوە بۆ وڵات

سەروەختێك ژیان لەم وڵاتەی خۆماندا جۆرێك لە گەمەی مەرگ بوو و زۆربەمان بە هەر ڕەنگێك بێت پرۆژەی کوشتن و لەناوچوون بووین. تۆ ئەگەر هەر هیچیش نەبوویتایە و لەگەڵ بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستاندا پەیوەندییەکیشت نەبوایە، ئەوە جەنگی ئێران و عێراق و جەنگی کەنداوی دووەم لێت بەمەلاس بوو، دەیان و سەدان خەڵکی ڕاپێچی شەڕێکی نەگریسی بێ‌مانا دەکرد کە لە ڕازیکردنی گومڕایی دکتاتۆرێکی تووڕەهات بەولاوە هیچیتر نەبوو، دکتاتۆرێك کە حەقیقەتی تەواوی لەو دەسگیرکردنە پڕ شوورەییەدا دەرکەوت.

لەو سەردەمەدا دەیان و سەدان کەس لە سەرەتای سالآنی هەشتاوە تا دوای ڕاپەڕین و ئەو کاتەی دکتاتۆرەکەی عێراقی تێدا بەچۆکدا هات ڕێی هات و نەهاتی هەندەرانیان دەگرتە بەرو کارەکە هێندە تێکەڵی و پێکەڵ‌ی تێکەوت کەوا چاك و خراپ، بازرگان و سیاسەتکار، ڕاونراوی ڕاستەقینە و ساختە هەر هەمووی پەلەقاژەی "بەهەشتەکەی" ئەوروپا و هەندەرانی بوو. ڕاستییەکەشی باری بژێویی سەختی خەڵك و ئەو جیاوازییە زۆرەی گۆڕینەوەی دراوی بیانی، بە تایبەتی دۆلار، لەگەڵ دیناری عێراقی هیچ نەکردووی هەلاوساودا پاڵنەرێکی گەورەی خەڵك بوو بە ماوەیەکی کەمی کارکردنی هەندەران بگەڕێتەوە ئێرە و بە شەش حەوت هەزار دۆلارێکەوە بتوانێ خانووی باش و ژنی جوان و ژیانێکی خۆش بۆ خۆی بڕەخسێنێت و وایکرد لە خەڵکەکە ڕەو ئاسا ڕوو لەو ئەوروپایە بکەن. لێرەدا مەسەلەکە لای خەڵك ڕوون و ئاشکرایە و بە هەمان شێوە هۆکارەکانیش و ڕەنگە زۆر پێویست بە شیکردنەوە ناکات.

لەو سەروبەندەدا من هەموو کات بە گاڵتەوە دەمگوت مەگەر فڕۆکەیەك بێتە لای ماڵەکەم و بمباتە ئەو هەندەرانە و ئەم سوعبەتەشم ڕاستییەکی تێدابوو، دەنا بەخوا تاقەتی هیچ جۆرە موغامەرەو سەرکێشییەکم نەبووە و نیشمە. من کەسێکی موحافزەکار نیم، بەلام هێند پەیوەندیی کۆمەلایەتیم بە خەڵکی خۆمانەوە بەتین بوو ڕۆژێ لە ڕۆژان بیرم نەدەکردەوە چۆن سەرجەمی ئەو سۆزو پەیوەندییە کۆمەلایەتیانە [illegible]بێبڕم، چاك بن یان خراپ.

بەلام سالی ١٩٩٦ و کۆتاییەکەی، ئەوەی بە گالتەوە دەمگوت گوایە مەگەر فڕۆکەیەك بێت بە مالّ و خێزانەوە بمبات دەڕۆم، بۆیڕەخساندم و دەرفەتێکی لەو جۆرەی سەرکێشییەکانی سندبادم بۆلوا و ئەو کەسانەی لە ڕێکخراوەکاندا لە کوردستان کاریان کردبوو ژیانیان کەوتە مەترسییەوە و هەلی چوونە ئەمەریکایان بۆ هەلکەوت و لە نزیکمانەوە فڕۆکە چاوەڕێی دەکردین فەرموون بۆ ئەمەریکا. ئەلبەتە منیش وەك ئەو چەند هەزار کەسە جلەوی خۆم دا بە دەست ئەو چارەنووسەوە و بە لۆجیکی ئەوەی با تاقیبکەمەوە خۆ نامخوات جلەوی خۆم دا بە دەست ئەو سەفەرە و چارەنووسە نادیارەکەیەوە.

ڕاستێکەی من نە لە ڕووی مادی و نە لە ڕووی مەعنەوییەوە زیانێکم نەکرد و بگرە ماوەی ئەو دوو سالەی ئەوێ و گەشتی دەوراندەوری زەوی لە بواری ئەزموونی دنیابینی و ژیان لە ناو کۆمەلگایەکی فرە ڕەهەند و فرە کولتووردا گەلێ شتی باشی پێبەخشیم و لە زۆر سەرەوە ئاشنای کردم بە ژیان و گوزەرانی ئەو جۆرە کۆمەلگایانە. لەوێ مانای پیرۆزیی کارم زانی و ئەو دەرسەی دامێ کەوا کار چۆن مرۆڤ و کۆمەلگە پێشدەخات و چۆنیش بنیادەم نوێدەکاتەوە و ئەقلّ و هۆشی پەرەدەستێنێ. لەوێ ڕاستە بیمەی بێکاری و سیستەمی سۆشیال یان وێلفەیرwelfare هەیە بەلام نابێ بەو پارووە نانەی بە دەستی خۆت پەیدای دەکەیت و منەتیش لە کەس نازانیت. هەرکەسێ کاری کرد جارێکیتر ناچێتەوە سەر پارەی بێکاری و گوزەرانی مەمرەومەژی بەو پارەیە. لە بایەخی کار و ئەو پیرۆزییەی کە تێی دەڕوانرێ لەوێ، خەفەتبار دەبیت بۆ ئەو مفتخۆرییەی لای خۆمان باوە و کەم کەس ڕێز لە کاری خۆی دەگرێ و دەسەلاتیش لە پشت خولقاندنی سوپایەك خەلکەوەیە کە بە ڕووکەش کاریان هەیە و مووچەخۆرن و بە واقیعیش بێکاری دەمامکدارن و بارن بە سەر ڕەوتی پەرەسەندن و پێشکەوتنی ژیانەوە. هەر ئەمەشە بووەتە نەریتێکی سەقەت و خوورەی ئەم کۆمەلگایە و بەردەوام توێژی مفتخۆر و قاچاخچی و دز و درۆزن بەرهەم دێنێ و تەماشا دەکەیت سالّ دێت و سالّ دەڕوات و هیچ بە هیچ نەبووە و گەندەلی پتر ڕەگی خۆی دادەکوتێ و چنگ دەخاتە بینی هەموو جۆرە گەشەکردنێکەوە.

بەهەرحالّ ئەم هەویرە زۆر ئاوکێشە و بواری ئەم باسەی ئێستای من نیە. بەلام با پێ لەوەش بنێین کەوا ڕاستە کار پیرۆزە لەوێ بەلام لە سەرێکی ترەوە هێند مرۆڤی پێوە جەنجالّ بووە کە دەرفەتی بۆ ژیانی ڕۆحیی نەهێشتووەتەوە و خەلك هەر ڕادەکات و

دەتوانم بڵێم بە هیچدا ناگات و ئەنجام بووەتە مرۆڤە ئامێریك و تەنها مەبەستی پارە پەیداکردنە، کە بەو ئاسانییەش پەیدا نابێت. لەبەر ئەوە کەس نیە بەلای کەمەوە دوو ئیش نەکات و بێگومان ئەمەش تەواوی وەختی مرۆڤ دەبات و پەراوێزێك نامێنێتەوە بۆ ژیانی ڕوحی و کۆمەڵایەتی. لەم ڕووەوە ئەوەی من بینیم جۆرێك بوو لە کارەسات، ئەڵبەتە لە دیدی خۆمەوە. چونکە کار بەڕادەیەك کاتت دەگرێ کە ئیتر ئاگات لەخۆت نامێنێ و بەرە بەرە بێهۆش و دەبەنگت دەکات و واتلێدەکات تەنها لە دەلاقەی پارەوە ژیان ببینیت.

ئەڵبەتە من لێرەدا مەبەستم ڕەشەخەڵکە هەژار و مامناوەندییەکەیە، کە ئێمە لەوێ بووین بە بەشێك لەوانە. بە بارێکی تریشدا دەوڵەمەندە قەبە و سەرمایەدارە خاوەن کارگە و بەرژەوەندیەکانیش هێند جەنجاڵی ئیدارەدانی پارە و پرۆژەکانی‌انن کە ناپەرژێنە سەر ژیانی ئاسایی و ڕۆحی و لەم خاڵەدا لەگەڵ خەڵکە مامناوەندییەکەدا یەکدەگرنەوە. ئەمەش وات لێدەکات کەوا هەست بکەیت لە کۆمەڵگایەکی بێئاگادا بژیت و لەو کولتوورەی کە پیێ ڕاهاتووی دابڕێیت، هەرچەندە خۆ ئێمە بە هەموو شتێکیشمان هەر نالێین ئامین.

لە سەرێکی تریشەوە منێك مندالّم لە سەر نەریت و کولتوورێك ڕابێت کە هی خۆم نەبن و ئەنجام بچنە ڕیزی ئەو خەڵکەوە کە نە بتوانن کولتووری نوێ قوبووڵ بکەن و ئەوەی خۆشمانیان لە دەست بچێت دەبێ چ تەیرێکیان لێدەرچێت و چۆن بتوانن خزمەتی ئایندەی خۆیان و وڵاتی ڕەسەنیان بکەن. ئەڵبەتە چیرۆکی ئیفلیجی لەم بابەتەش زۆرن و هەرکەسەمان چەندین حیکایەت و بەسەرهاتی ئەو خەڵکەی لایە کە بە دەردی خراپ چوون. کە واتە لە دوو سەرەوە من گرەو نابەمەوە، یەکەمیان دەبێ ڕۆژ تا ئێوارە بڕەتێم و کار بکەم بۆ دابینکردنی بژێویی ڕەشەخێزانێك کە هەر چوار مندالّەکەم پێش تەمەنی کار کردن بوون تێیدا، گوایە چیە لە ئەمەریکادا دەژیم. دووەمیان لە ڕووی کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆجییەوە کەسمان دانوولەمان لەگەڵ ئەو نەریت و بارە کۆمەڵایەتییەدا نەدەکولا، کە لە ئەڵقەکانی پێشتردا ئامارەم بۆ کردووە و من و دایکیان تووشی دەردی غوربەت یان هۆم سیك home sick بووبووین چونکە لە شوێنێك بووین دابڕاو لە زۆربەی دۆست و ئاشناکانمان و بەردەوامیش خەریکی کارکردن بووین و هیچیشمان بە هیچ نەدەبوو. ئەو غوربەتە تاڵە وایلێکردبووین لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە دڵمان زۆر بە عەرەب و فارس و تەنانەت هندی و پاکستانیش دەکرایەوە و تەماشا دەکەین مندالّەکانیش، سەرباری زیرەکییان لە خوێندندا، بەڵام تووشی هەمان دەردی دووریی ئێمە

بوون و هەرکە گوێیان لە کاسێتێکی گۆرانیی کوردی دەبوو بێدەنگ فرمێسك بەچاویاندا دەهاتە خوار. لەگەڵ دایکیان بیرێکمان لێکردەوە تا ئەم منداڵانە دەگرین و تکامان لێدەکەن بابیانبەینەوە با بڕیاری خۆمان بدەین، ئەگینا پاش چەند ساڵێکی تر کار وادەکەوێتەوە ئێمە بگرین و بمانەوێ بیانهێنینەوە بۆ وڵات و ئەوانیش ئەو دەمە پێبکەنن و گاڵتەمان پێبکەن، وەك ئێستا لە گەلێ خێزانی کورد قەوماوە.

ئێمەیەکی تا سەر ئێسقان پەروەردەی کۆمەڵگەیەکی نیمچە داخراو هەروا ئاسان نیە دەسبەرداری هەندێ نەریت بین کە فریشکمان پێوە گرتووە و بووە بەخووی شیریمان، با لافی پێچەوانەش لێبدەین. من لەگەڵ ڕەوتی گۆڕان و پێشکەوتنی کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدام و باش دەزانم مەسەلەکان ڕێژەیین و ئەمەی ئێستا داکۆکی لێدەکەم پاش سەد ساڵی تر هەر لە کۆمەڵگاکەی خۆمدا شتیکی ترە. بەلام هیچ کاتێ مرۆڤی ئاسایی بەدەر نەبووە لە یاسا و ڕێسای ئەو سەردەم و زەمانەی تێیدا ژیاوە. من لە شوێنی کارەکەمدا کوڕێکی ڕەشپێستی برادەرم بوو ناوی ویل و خەڵکی مەشیگان بوو، دۆستایەتیمان زۆرخۆش بوو. جارێکیان پێمگوت ویل من ناوم محەمەدە و کوڕی فلان کەسم و ئەمەش ناوی بنەماڵەکەمە ئەی تۆ؟ ئەویش لەوەلامدا بزەیەك گرتی و وتی من بنەماڵەم نیە و دایکم لە بۆیفرێند منی بووە، واتە کوڕە هاوڕێ یان هاوسەری ناشەرعی. ئەمەی زۆر بە ئاسایی باس دەکرد و مێشێکیش میوانی نەبوو. پێمناڵێ‌ی کێ لای ئێمە خۆی بەوە بزانێ پێشکەوتووترین کەسە و نەریتی کۆمەڵگاکەی ڕەتبکاتەوە دەتوانێ قسەیەکی وەك ئەوەی ویل بکات؟ ئەمە ئێستا وایە بەلام پاش سەد و دوو سەد ساڵی تر ڕەنگە مەسەلەکە لە کۆمەڵگای ئێمەشدا جیاواز بێت. باشە تۆ پێت قووتدەچێت ببیتە بەشێك لەکۆمەڵگەیەك کە زیاد لە ٣٠٪ ی منداڵ تێیدا دایك دیارە و کەس نازانێ باوکیان کێیە!؟

لە سەرێکی تریشەوە من کەم تا کورتێك خۆم بە نووسین و وەرگێڕانەوە خەریك کردووە و بەتەما بووم لەوێ کەشێکی ڕۆشنبیری لەبار بدۆزمەوە و بتوانم ئەو کەمە توانایەمی تێدا بخەمە گەڕ کەچی لە کوێرەوەریی کارکردنی سەرومڕ بەولاوە هیچیتر نەبوو. کەواتە ئەمیشیان هیچ و گەلێ نووسەری زۆر باشی لای خۆمان چوونە هەندەران و لەحیاتی پێشکەوتن لەوێ پووکانەوە. من لە بێکاری و پشوودانەکەی دوورگەی گوامدا کتێبی جینۆسایدم کردە کوردی و پێموابوو کە چوومە ئەمەریکاوە میدل ئێست ووچ، کەخاوەنی کتێبەکە بوو، بە گەرمی پێشوازیم لێدەکەن و پێم دەڵێن "دەستەکانت خۆش

بێت کاکه حەمه بۆ کارێ کە کردووتەوە !" و خێرا بۆم چاپ دەکەن و خەیاڵیشم لەوە زیاتر ڕۆیشت کەوا ڕەنگە بانگهێشتم بکەن کاریان لەگەڵ بکەم ، کەچی دەردی شێخ ڕەزا دەڵێ "شێر وانەبوو" بەڵکو ڕێگریشیان لێکردم و وتیان خۆ ئێمە تەکلیفمان لێنەکردووی بۆ لەخۆتەوە کاری وات کردووە. ماڵی ئاوابێت د. بەرهەم ساڵح لە سەر ئەو کتێبە شەڕی زۆری بۆ کردم، کەچی ئەو دەزگایە هەر ملیان نەدا و ئەنجام کتێبمان هێنایەوە لە کوردستان چاپمان کرد. لێرەدا جێی خۆیەتی سوپاسی گەلێ دۆستی نووسەر و ئەدیب بکەم کە پشتگیرییان لێکردم بۆ ئیجازەدانی چاپی ئەو کتێبە، لەوانە بەڕێزان دلێر شوکری، مامۆستا مەحمود تۆفیق، د. ڤێرا سەعیدپوور، حەمە ساڵح جەباری و گرووپێك لە برادەرانی ساندیاگۆ – کالیفۆرنیا، قادر سەرچناری و ئامانج شاکەلی و هاوڕێی شاعیرم کاك فەرهاد شاکەلی و گەلێ دۆستی تر. هەر لە ڕێکخراوی هیومان ڕایتس ووچیش سوپاسی هانی مەجالی بەرپرسی بەشی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستی ئەو ڕێکخراوە دەکەم کەوا زۆر پشتگیریی لەچاپدانی لێدەلکردم بە هەمان شێوەش د. یوست هیلتەرمان، کەوا کاتی خۆی سەرپەرشتی پرۆژەی ئەنجامدانی ئەو کتێبەی دەکرد، زۆری بەلاوە بوو بە کوردی بلاوبێتەوە کەچی هەندێ کەسی ئەو ڕێکخراوە و پێموایە دەستی کوردێکی دانیشتووی لەندەنیشی تێدابوو، کە هیومان ڕایتس ووچ ڕاویچڕی پێکردبوو، بوون بە کۆسپ لە بەردەم لەچاپدان و بلاوبوونەوەی وەرگێڕانی کوردییەکەی ئەوکتێبەدا.

کەوابوو ئەمەشیان هەر هیچ ! ئەی ئیتر بۆ لە ئەمەریکایەکدا دانیشم کە هیچ هیوا و ئامانجێکی شەخسی و کۆمەلایەتی و گشتیمی تێدا بەدی نەیەت. خۆ ولاتی خۆیشم لە ژێر دەستی ڕژێمی عێراقدا نەمابوو و ئەو هەڕەشەیەشی کە لە ساڵی ١٩٩٦ دا باسی لێوەکرا وا دەرنەچوو. پەندێکی ئینگلیز هەیە دەڵێ "East and West Home is best" بە واتای ولاتی خۆت لە هەر شوێنێکی تری دنیا باشترە.

داوای لێبووردن دەکەم من نامەوێ ئەم تاقیکردنەوەیەی خۆم گشتگیر بکەم و بلێم ئەوەی من کردوومە بۆ هەموو کەس ڕاستە، چونکە هەر کەسە و باروزرووفی تایبەتی خۆی هەیە و لەو خەلکەی کە ڕۆیشتن ئێستا دەیان ئەزموونی خۆپێگەیاندن لەڕووی خوێندن و گوزەران باشکردنەوە هاتووەتە ئاراوە و گەلێ کەس لە هەندێ پێگە و شوێندا سوود بە کۆمەلگە و ولاتەکەی خۆی دەگەیەنێت و لە پاڵ دیاردە نەگەتیڤەکانیشدا لایەنی پرشنگدار جێی خۆی کردووەتەوە.

